عەبدولمونعیم غولامی

# سێ قوربانییەکە

شێخ سەعید بەرزنجی

شێخ عەبدولسەلام بارزانی

شێخ زاری ئەلزەویەعی

وەرگێرانی: ئیحسان ئیروانی

عەبدولمونعیم غولامی

# سێ قوربانییەکە

شێخ سەعید بەرزنجی-شێخ عەبدولسەلام بارزانی
شێخ زاری ئەلزەوبەعی

وەرگێڕانی: ئیحسان ئیروانی

ناوی کتێب: سێ قوربانییەکە
نووسینی: عەبدولمونعیم غولامی
وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە: ئیحسان ئیروانی
بڵاوکراوەی ئاراس- ژمارە: ٢٧٣
دەرهێنانی هونەریی ناوەوە و بەرگ: ئاراس ئەکرەم
سەرپەرشتیی کاری چاپخانە: ئاوڕەحمانی حاجی مەحموود
چاپی یەکەم ، هەولێر- ٢٠٠٤
لە کتێبخانەی بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی ڕۆشنبیری و هونەر لە هەولێر
ژمارە (٢٠٤)ی ساڵی ٢٠٠٤ی دراوەتێ

## ڕوونکردنەوەیەک

ئەم پەرتووکەی لە بەردەستتانە، سێ وتاری تێروتەسەلی مێژوویی لەخۆدەگرێت، ناوەڕۆکەکانیان سەربوردەی سێ ڕووداوی لەیەکتر جیای سات و شوێن و هۆکار دەگێڕێتەوە. نووسەری وتارەکان سەرەتای هەر ڕووداوێکی بەچەند زانیارییەک دەربارەی سەنگ و پایەی کەسایەتی مەبەست دەسپێدەکات، ئینجا ڕەوش و بارودۆخی گوزەرانی ئەوسامان بۆ باس دەکات، پاشان هۆکارو چۆنیەتی سەرهەڵدانی ئاریشەکان شرۆڤە دەکات، دواتر دەرەنجامە خوێناوییەکان و کاردانەوەکانیان دەخاتەڕوو.

دوو لەو ڕووداوانەش، کە پەیوەستن بەگەلی کوردمان، کاریگەرییەکی زۆریان لەسەر ئاراستەی ڕێڕەوی بیروبۆچوونی سیاسی و کۆمەڵایەتیی لەنێو کۆمەڵگای کوردەواریدا هەبووە، بەتایبەتی لەسێدارەدانی یەکەم ڕابەری شۆڕشی بارزان لە سەدەی بیستەمدا بووە هەوێنی سووربوونی سەرکردایەتی شۆڕش و وڵاتپەروەران لەسەر بەرخودان تا گەیشتن بەڕۆژی ئازادی گەل و ڕزگاری وڵات لە دەست بێگانە.

گرنگی ئەم پەرتووکەش لەوەدایە، کە بەپێنووس و هزری نووسەرێکی عەرەبی عیراقی نووسراوەو، هەر خۆیشی هاودەمی ئەو ڕووداوانە بووە. هەروەها بڵاوکەرەوەکەشی کە هەستاوە بەکۆکردنەوەی وتارەکان و لەچاپدانی پاراستوونی لە فەوتان و بەهەردووکیان کارێکی پیرۆزیان بۆ ئەنجامداوین.

بێگومان، ئەم پەرتووکە کە لەسەر شێوەی گێڕانەوە نووسراوە، بەسەرچاوەیەکی هەرە سوودبەخش دادەنرێت بۆ مێژوونووسان و ئارەزوومەندانی زانین و ڕۆشنبیری. هەروەها خوێنەرانی بەگەشتێکی ئەندێشەیی دەباتە نێو دەیەکانی یەکەمی سەدەی ڕابردوو.

مایەوە بڵێیم، کە هەر لە تەمەنێکی زووەوە (لە کۆتایی هەشتاکان) ئەم پەرتووکەم وەک سەرچاوەیەکی سوودلێوەرگیراو لەنێو هەندێک لەو پەرتووکە مێژوویی‌یانەی خوێندومەتەوە بەرچاوکەوتووە، بەڵام بەبێ ئەوەی بیرم بۆ دەستخستنی چوو بێت، ئەگەرچی دۆزینەوەشی سەخت بوو. تاکو جارێکیان (لە ئەیلولی/٢٠٠١) سەردانی رێزدار «شێخ جیهاد شێخ ئیسماعیل شێخ عەبدولسەلام بارزانی»م کرد، بەرێککەوت باسی ئەم پەرتووکەی بۆ کردم و دانەیەکی کۆپیکراوی پێ بەخشیم. دوای خوێندنەوەی بیری وەرگێڕانیم بۆ سەر زمانی کوردی لەلا گەڵاڵەبوو، نەخاسمە کە ئێستا خوێنەری کوردی لە زیادبوون دایە. بەرێزیشیان هانی دام.

لە وەرگێڕانیشیدا هەوڵێکی زۆرم داوە بەبەکارهێنانی کەمترین وشەی بیانی دەقاودەق وەکو خۆی بیکوردێنم و، بەلەبەرچاوگرتنی روونکردنەوەو پەراوێزی پێویست، بەبێ ئەوەی دەستکاری دەقە ئەسڵییەکە بکەم.

لە کۆتاییدا، رێزو پێزانینم هەیە بۆ هەموو ئەو لایەن و بەرێزانەی هاوکارییان کردووم.

ئیحسان ئیروانی
هەولێر - ٢٠٠٢/١١

## پێشکەشکردن

زۆرێک لە مێژوونووس و توێژەرەوەی بیانی باڵیان کێشاوەتە سەر هەندێک لە رووداو و بەسەرهاتەکانی مێژووی هاوچەرخی کورد، ژمارەیەک نووسەری عەرەبیش لەم بوارەدا شوێنپەنجەیان دیارە، گرنگی دانی ئەمانەش پتر بەو رووداوانەبوو ئەوانەی لە کوردستانی باشوور (عیراق) بەرپابووبوون زیاتر لە پارچەکانی تری کوردستان، بەتایبەتیش دوای ئەوەی کوردستانی باشوور بووە پارچەیەک لە دەوڵەتی عیراقی تازەدروستبوو کە دوابەدوای پەرەسەندنەکانی پاش کۆتاییهاتنی جەنگی یەکەمی جیهان پێکهێنرا، ئەو دەوڵەتەی کە لەسەر بنەمای سیستمێکی فەرمانڕەوایی عەرەبی-سونی بەرێوەدەچوو.

چەند هۆکارێک هەن پاڵیان بەتوێژەرەوەو مێژوونووسانی عەرەب وەناوە بۆ دەستکردن بەلێکۆڵینەوە لە مێژووی کورد، لەنێویاندا هەبوون هەوڵیان داوە ئەو مێژووە بشێوێنن، ئەمەش بەهۆی چەند پاڵنەرێکەوە، گرنگترینیان پاڵنەری رامیاری و دەمارگیری بۆ نەتەوەی عەرەب لە دژی نەتەوەی کورد، دەتوانرێت بەروونی تێبینی ئەمە بکرێت لە نووسینەکانی هەندێک پێشەنگانی نەتەوەپەرستی عەرەب لە نموونەی «ساطع الحصري»و «أمين الريحاني»و هیتریش لەوانەی پەیەوەندی توندوتۆڵیان لەگەڵ گەورە سیاسەتمەدارانی عیراقدا هەبوو. لێرەدا نووسینەکەی «د. فاضل البراك» - کە یەکێکە لە کۆڵەگەکانی دەزگای ئاسایشی عیراق لە هەشتاکانی سەدەی بەسەرچوو- بەنموونە دەهێنینەوە، کە هەوڵی داوە لە پەرتووکەکەیدا (البارزاني الأسطورة والحقيقة) وێنەی راستەقینەی راپەرینە کوردییە یەک لەدوای یەکەکانی دەڤەری بارزان بشێوێنێت، نەخاسمە ئەوانەی رابەری کورد مەلا مستەفای بارزانی سەرکردایەتیی دەکردن.

لەلایەکی تریشـــەوە نـووســـەری تری عـــەرەب هەن بەپاکی و بێگەردی ناسراون و خـۆیان دوورخستـۆتەوە لە دەمارگـیری بۆ نەتەوەی عەرەب یان بەهەندهەڵگرتنی خۆبەستنەوە بەسیاسەت، باشترین نموونەی ئەوانەش «عزیز شریف»ە، کە لە نووسینەکانیدا جەختی لەسەر مافی ڕەوای گەلی کـورد کردووە بۆ بەدەستهێنانی مافـە نەتەوایەتییەکـانی. «شـاکـر خصباك»یش ڕاستگۆیانە باسی مێژوو و جوگرافیای کوردستانی کردووە. هەروەها نووسەرو مێژوونووسی عیراقی «جرجیس فتح الله» کە زیاتر لە ڕوویێکەوە خزمەتی مێژووی کوردی کردووە جا چ لە ڕێی نووسینەکانیەوە بێت چ لە ڕێی هەوڵە بێوچانەکانی بۆ وەرگێڕانی زۆرێک لە پەرتووکی ڕەسەن و بەهادارەوە بووبێت، بەتایبەتی ئەو پەرتووکانەی باس لە ڕووداوە مێژووییەکانی کوردستانی عیراق دەکەن.

هەندێکی تریش هەن ڕاستگۆ بوونە لە گێڕانەوەی ڕووداوەکانی مێژووی کـورد، بەڵام لەتەک ئەمەشدا دەمارگیری خۆیان بۆ نەتەوەی عەرەبیان و ڕەچاوکردنی لایەنی سیاسی لە هەندێک بواردا نەشاردۆتەوە، بەرچاوترین ئەوانەی ئەم ڕێچکەشیان گرتبووەبەر «عەبدولمونعیم ئەلغولامی»یە.

ئەلغولامی لە ساڵی ١٩٠٤ لە شاری مووسڵ لە خانەوادەیەکی ناسراو بەزانست و وێژە لەدایکبووە، ئەویش بنەماڵەی سەیدەکانی غولامیی- تەغلوبیی مووسڵییە، کە هۆزانڤان و ئەدیب و مێژوونوسیان لەنێودا هەڵکەوتوون، وەک «شێخ محەمەد بن مستەفا ئەلغولامی» (ساڵی ١٧٧٢ کۆچی دوایی کردووە) خاوەنی پەرتووکی (شمامة العنبر والزهر المعنبر). ئەلغولامی خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی و ئامادەیی خۆی لە مووسڵ تەواوکردووە، لە ساڵی خوێندنی ١٩١٥-١٩١٦ چووەتە خانەی مامۆستایان، دوای لێ دەرچوونیشی لە پیشەی فێرکاری کاری کرد تاکو خانەنشینبوونی لە ساڵی ١٩٥٨، و لە بەرواری ٢٣ تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٦٧ کۆچی دوایی کرد.

ئەندامانی خانەوادەکەی بەشداریێکی هەمەچەشنەیان هەبوو لەو جموجۆڵە نەتەوەییە عەرەبییەی لە نیوەی یەکەمی سەدەی ڕابردوو لە

مووسڵ تەشەنەی کردبوو، بەتایبەتیش براکەی «محەمەد رەئووف ئەلغولامی» کە لە دامەزراندنی زۆرێک کۆمەڵەو رێکخراوی نەتەوەیی عەرەبی بەشداری کردبوو، ئەمەش کاریگەری خۆی لەسەر عەبدولمونعیم ئەلغولامی هەبوو و لە تەمەنێکی زووەوە بووە ئەندام لە زۆرێک لەو کۆمەڵەو رێکخراوە نەتەوەییە عەرەبیانەی لە سەرەتاکانی سەدەی رابردوو لە مووسڵ دامەزرابوون، ئەو بەیەکەمەکانی بەئەندامبووی کۆمەڵەی (العلم)ی نەتەوەیی عەرەبی دادەنرێت، کە لە پێش جەنگی یەکەمی جیهان لە ساڵی ١٩١٤ دامەزرابوو و زۆرێک گەنجی هۆشیاری شاری مووسڵ چووبوونە ریزیەوە، ئەم کۆمەڵەیە تاکو رۆژی ٢٤ی مایسی ١٩١٩ بەردەوام بوو کاتێک ناوی گۆڕدرا بۆ کۆمەڵەی (العهد)، هەروەها لە هەمان کاتدا لە رێکخراوێکی تریش کە بەناوی (جامعة الآداب)بوو ئەندام بوو، ئەویشیان هەر لە مووسڵ لە ساڵی ١٩١٨ دامەزرابوو و تێدەکۆشا بۆ بڵاوکردنەوەی رۆشنبیریەتی نەتەوایەتی عەرەبی. سەرەڕای بۆچوونە نەتەوایەتییەکانی، ئەلغولامی هەڵگری بۆچوونی ئیسلامیش بوو، ئەمەش لە بەئەندامبوونی لەنێو هەندێک لەو رێکخراوە ئیسلامییانەی لە ساڵی ١٩٣٠ لە مووسڵ دروستببوون وەک کۆمەڵەی (الشُبان المسلمين) بەرجەستە دەبێت. هەر ئەمەشیان هۆی باسکردنی رووداوەکانی مێژوو، لەنێویان مێژووی کورد بەدیدێکی عەرەبی-ئیسلامیمان بۆ ئاشکرا دەکات.

جگە لە کارە رامیارییەکەی، ئەلغولامی پشکداری لە کاری رۆژنامەوانیشدا کردووە، لەنێو رۆژنامەکانی مووسڵ و بەغدادا بەناوی راستەقینەی خۆی یان بەناوی خوازراوەوە وتاری مێژوویی و رامیاری بڵاودەکردنەوە، لە رۆژنامەی (صدى الأحرار)ی مووسڵی بەناوی (مؤرخ)ی دەنووسی، لە رۆژنامەی (العراق)ی بەغداییش بەناوی (تغلبي)، لە رۆژنامەی (نصير الحق)ی مووسڵیش بەناوی (أبو وائل)ی دەنووسی.

ئەلغولامی زۆر پەرتووکی دەربارەی مێژووی هاوچەرخی مووسڵ نووسیوون، یەکەم پەرتووکی بەناوی (السوانح في الأحداث الوطنية) لە

سـالّى ۱۹۳۲ دەری کـردووە، کـە پێکهـاتووە لە کـۆمـەڵە وتارێکی بەڵگەداری باوەرپێکراو سەبارەت بەبزاڤی نەتەوەیی عەرەبی لە مووسڵ لە پێش جەنگی یەکەمی جیهان و دواتری، پەرتووکی دووەمیشی بەناوی (أسرار الكفاح الوطني في الموصل ۱۹۰۸-۱۹۲۵)ە، بەشەکەی یەکەمی لە سالّی ۱۹۵۸ لە بەغدا چاپ کرد، تیایدا باس لە مێژووی رێکخراوە رامیارییە نهێنی و ئاشکراکانی مووسڵ دەکات، هەر لە کودەتا دەستوورییە عوسمانییەکەی سالّی ۱۹۰۸ تاکو یەکلاکردنەوەی کێشەی مووسڵ. سالّی ۱۹۳۹ش پەرتووکی (خروج العرب من الأندلس)ی دەرکرد، سالّێک دوای ئەویش پەرتووکی (مآثر العرب والإسلام في القرون الوسطى)ی دەرکرد، لە سالّی ۱۹۵۰ش پەرتووکی (بقايا الفرق الباطنية في لواء الموصل)ی بلاّوکردەوە، لەگەڵ چەندەها پەرتووکی تری بلاّوکراوەو بلاّونەکراوە.

ئەلغولامی لە بواری مێژوودا تەنها گرنگی بەعەرەبەکان نەداوە، بەڵکو گرنگی بەهەندێک رووداوی سەرنجڕاکێشی مێژووی هاوچەرخی کوردیشی داوە، نەخاسمە ئەوانەی لە کوردستانی باشووردا روویانداوە، لەم لایەنەشەوە هەندێک نووسینی هەیە، لەوانە پەرتووکی (ثورتنا في شمال العراق ۱۹۱۹-۱۹۲۰)و پەرتووکی (**الضحايا الثلاث**) واتە (**سێ قوربانییەکە**)، کە لە بنەڕەتدا لە کۆمەڵە وتارێک پێکهاتووەو کاتی خۆی لە سالّی ۱۹۵۱ لە رۆژنامەی (صدى الأحرار)ی مووسڵی بلاّوکراونەتەوە، لە سالّی ۱۹۵۵ش مامۆستا «حەمادی ئەلناهی» کۆی کردوونەتەوەو لەسەر شێوەی پەرتووکێک چاپ و بلاّوکردۆتەوە، چۆنیەتی ئەنجامدانی ئەم کارەشی لە پێشەکی پەرتووکەکەدا لەژێر ناونیشانی (**وتەی بلاّوکەرەوە**)دا باس کردووە، هەروەها دوای ئامادەکردنی کتێبەکە خودی نووسەر هەندێک پەراوێزی روونکەرەوەی بۆ نووسیوە، وێڕای ئەمەش پەرتووکەکە بەدەر نەبوو لەو هەلاّنەی وەرگێڕ هەوڵی راستکردنەوەیانی داوەو ئەویش لەلای خۆیەوە پەراوێزی پێویست و روونکەرەوەی بۆ زیاد کردوون. پەرتووکەکە باس لە رووداوەکانی سێ کێشە دەکات، یەکەمیان:

الضحايا الثلاث

الشيخ سعيد البرزنجي

الشيخ عبدالسلام البارزاني

الشيخ ضاري الزوبعي

بقلم :

عبدالمنعم الغلامي

الناشر

حازي الهاشمي

١٣٧٥هـ - ١٩٥٥م

مطبعة الهدف - الموصل

رووداوی کوژرانی شێخ سەعید بەرزنجی و بارودۆخی ژیانی ئەوسای شاری موسڵ، دووەمیان: زۆرداری دەسەڵاتداریەتی عوسمانی و داواکاریەکانی شێخ عەبدولسەلام بارزانی و چۆنیەتی لەسێدارەدانی، سێیەمیان: شێخ زاریی زەوبەعی و کوژرانی ئەفسەرێکی ئینگلیز و کێشەی دەستگیرکردنی.

پەرتووکی (سێ قوربانیەکە) بەسەرچاوەیەکی هەرە گرنگ و دەگمەن دادەنرێت بۆ هەر یەکێکی بییەوێ لەسەر مێژووی کوردستانی باشوور -لە ماوەی سەرەتاکانی سەدەی بەسەرچوو- بنووسێت، یاخود بییەوێ زانیاری لەسەر ڕێڕەوی ڕووداوەکانی ئەو ماوەیە دەستبخات، نەخاسمە کە دوو ڕووداوی نێو پەرتووکەکە پەیوەستن بەدوو کەسایەتی پایەدار و ناوداری کوردان، ئەوانیش «شێخ عەبدولسەلامی بارزانی»و «شێخ سەعیدی بەرزنجی»ن. نووسەری پەرتووکەکەش کە هاودەمی هەرسێ ڕووداوەکە بووە، بۆ زانیارییەکانی پشتی بەژمارەیەک سەرچاوەی نووسراو و بینەری ڕووداوە ئاماژەبۆکراوەکان بەستووە.

ئەلغولامی لە پەرتووکەکەی (سێ قوربانییەکە)دا هەوڵیداوە ستەمدیدەیی گەلی کورد بەدیاربخات و ئەو زوڵم و زۆربەی لەژێرسایەی حوکمی عوسمانییەکان دەیچێژت بخاتەڕوو، هەروەها هەندێک وشەی بەکارهێناوە نیشانەی ئەوەن کە هاوسۆزبووە لەگەڵ ڕابەرو ئەو کەسایەتییە کوردییانەی ڕۆڵیان لەو ڕووداوانەدا هەبووە، وەک بەکارهێنانی وشەی (شەهیدبوون) بۆ کوژرانی شێخ سەعید بەرزنجی و گیانەکەی بە(پاک و بێ گوناه) ناودەبات، هەروەها دیمەنی لەسێدارەدانی شێخ عەبدولسەلام

بارزانی بە(دڵتەزێن) ناودەبات. لەگەڵ ئەمەش ئەلغولامی خۆی تووشی هەڵە کردووە لە بارەی هەندێک لایەنی تایبەت بەگەلی کورد جا چ بەئەنقەست وایکردووە یان نا. بۆ نموونە نووسەر لە پەرتووکەکەیدا ناوی (کوردستان)ی بەکارنەهێناوە، بەڵکو لەجیاتی ئەوە ناو و دەربڕی تری وەک (ولاتی کوردان) یان (ناوچە کوردیەکان)ی بەکارهێناوە. لە پەرتووکەکەی تریشیدا (ثورتنا في شمال العراق) هەمان ڕێچکەی گرتۆتەبەرو وشەی (باکووری عیراق)و (ناوچە باکوورییەکە)ی بەکارهێناوە. هەروەها ئەلغولامی نەیویستووە ڕۆڵی کارلێکەری نەتەوەیی لە ڕاپەڕینەکەی شێخ عەبدولسەلامی بارزانیدا بوروژێنی. بەهەمان شێوەش کاتێک باس لە ڕاپەڕین و بزاڤە کوردییەکانی ساڵانی ١٩١٩-١٩٢٠ دەکات، وەک بڵێی ویستبێتی ڕاپەڕینە کوردییەکان لە ناوەرۆکە نەتەوایەتییەکەی داشۆرێنی، ئەمەش لەوەڕا بەدیار دەکەوێت کاتێک هەوڵ دەدات هۆکارەکانی بەرپابوونی ڕاپەڕین و شۆڕشە کوردییەکان ببەستێتەوە بەرۆڵی کۆمەڵە نەتەوایەتییە عەرەبییەکان نەک کوردییەکان، کاتێک لە پەرتووکەکەیدا (أسرار الکفاح الوطني في الموصل) لەم بارەیەوە دەڵێت:"کۆمەڵەی (العَلَم)و (العهد) ڕۆڵیان هەبوو لە وروژاندنی هەستی نیشتمانی و بەرپاکردنی شۆڕش لەگەلێک لە ناوچە باکوورییەکان لە دژی ئینگلیزەکان لە ساڵی ١٩١٩".

لەبەر ڕۆشنای ئەمەی سەرەوە بەدووری نازانین ئەلغولامی کەوتبێتە ژێر کاریگەری هەندێک لەو باڵ و ئاراستە نەتەوەییە عەرەبییە توندڕەویانەی لە ناوچە جیاجیاکانی عیراق سەریان هەڵدابوو بەتایبەتی لە شاری مووسڵ -کە شوێنی لەدایکبوونی نووسەرە. لەگەڵ ئەمەشدا پەرتووکی (سێ قوربانییەکە) گرنگی مێژوویی خۆی هەیەو پڕ سوودە بۆ ئێمەی کوردی سەرگەردان بەدوای ڕاستییەکانی مێژوومان، ئومێدەوارین ئەم پەرتووکەش کەلێنێکی پەرتووکخانەی کوردیمان پڕبکاتەوە.

عەزیز حەسەن بارزانی
٢٠٠٢/٧

بەناوی خودای بەخشندە و میهرەبان

## وتەی بڵاوکەرەوە

لەنێو هەندێک ژمارەی رۆژنامەی (صدى الأحرار)ی مووسڵیدا، کە مامۆستای زانا و نیشتمانپەروەری گەورە بەرێز محەمەد رەئووف ئەلغولامی خاوەنی بوو، ئەو ژمارانەی لە ماوەی ساڵی ١٩٥١ بڵاوکرابوونەوە هەندێک وتاری مێژوویی-سیاسی رووداوی خوێناویم تیایدا دۆزینەوە، کە لە کاتی روودانیاندا دەنگدانەوەی خۆیان هەبووە، هۆکار و وردەکاریەکانیشیان لەلایەن خەڵکێکی زۆر بەتەمومژاوی ماونەتەوە.

نووسینەکانیش بەپێنووسی مێژوونووسی توێژەرەوە مامۆستا عەبدولمونعیم ئەلغولامی بوون.

کاتێک بینیم کە ئەو وتارانە رووناکییەکیان خستووەتە سەر ئەو تاریکاییەوەو هەندێک لایەنی شاراوەی لای زۆرێک لە هاوڵاتییانی ئاشکرا کردووە. و لەگەڵ ئەوەی کە من حەزم لە بەدواداچوونی ئەم جۆرە توێژینەوە مێژووییانەیە، بەتایبەتی هەندێک رووداوی تایبەت، بۆیە روخسەتخوازیم لە هەڤاڵی مەزن، نووسەری وتارەکان کرد بۆ چاپ کردن و بڵاوکردنەوەیان لەسەر شێوەی نامیلکەیەکی سەربەخۆ بۆ خوێندنەوەو سوود لێ وەرگرتنی لەلایەن توێژەرەوەو بەدواداچووی لە نموونەی خۆم، بۆ روونبوونەوەی راستیی ئەو بەسەرهاتانە بۆیان، ئەویش بەسوپاسەوە رێی بەبڵاوکردنەوەی دام. رێی دام بەروون و رۆشنی بڵاوبکرێنەوە دوای ئەوەی هەندێک گۆڕانکاری خستنەسەر.

ئیستاش وا دەیخەمە بەردەستی خوێنەری بەرێز، ئومێدیشم زۆرە کە دەبێتە مایەی رەزامەندی خوێنەرە بەرێزەکان و بەدواداچووان، کە

کۆکەرەوەی چەند رووداوێکی مێژووی نزیکمانن، هێشتان دەنگدانەوەیان دەلەرێنەوە. ئەگەریش توانیبێتم تێنوویەتی ئارەزووی هەوادارانی پەیپێبردن تێر بکەم ئەوە مەبەستمە، ئەگەرنا ئەوە تەنها خزمەتی مێژووییم نیازە، خوداش لە پشتەوەی مەبەستەکانەو هەر بەپشت و پەنای ئەو دەست پێ دەکەم.

حەمادی ئەلناهی
١٣ی صەفەری ١٣٧٥ی
تشرینی یەکەمی ١٩٥٥

**وتاری یەکەم:**

## رووداوەکەی شێخ سەعید بەرزنجی لە موسڵ

هۆکارەکانی - وردەکارییەکانی - دەرەنجامەکانی

خوالێخۆشبوو شێخ سەعیدی بەرزنجی[١] لە سەردەمی دەوڵەتی عوسمانیی تورکیی لەناوچوو زۆر دەستڕۆیشتوو بوو لە سلێمانی و دەوروبەرەکانی، ئەم دەسەڵاتە ئایینیەشی بەمیرات لە باپیرەکەی «کاک ئەحمەدی شێخ»ی ئایینپەروەری کوڕی زانای زانستوان «مەعروف نۆدێی[٢]» -کە خاوەنی چەندەها پۆلێنکاری هەمەجۆرە لە بوارەکانی زانستی ئایینی ئیسلامی و زمانەوانی عەربی، جیا لەوەی کە یەکەم بڵاوکەرەوەی ڕێبازی (قادری)بووە لە ناوچەی سلێمانی- بۆ ماوەتەوە.

لە ڕاستیدا مەڵبەندی ئایینیی خوالێخۆشبوو شێخ سەعید هەر تەنها لە ناوچەی سلێمانی نەبوو، بەڵکو تێپەڕی بوو بۆ زۆر جێگای تری وەک کەرکوک و شوێنانی تر، بەهۆی ناوبانگە فراوانەکەی بەئایین و خواناسی بووە مایەی متمانەپێکردنی خوالێخۆشبوو سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەمی عوسمانی، بەجۆرێک، ببووە یەکێک لە نزیکترین کەسانی، هەروەکو چۆن لە گەڵ باپیریشی کاک ئەحمەدی شێخ دلۆڤانیی خودای لەسەر بێت هەر وابوو.

جا چونکە هەر خاوەن دەسەڵات و دەستڕۆیشتوویەک -جا هەر جۆرێک بێت، ئیرەییبەر (حەسود)و ڕکابەری بەنهێنی یان بەئاشکرای هەن،

---

(١) (بەرزنجە) ناوی گوندێکە دەکەوێتە ڕۆژهەڵاتی [شاری] سلێمانی، ئێستا مەڵبەندی ناحیەی (سروچک)ە لە قەزای (شارباژێڕ) لە لیوای سلێمانی.

(٢) (نۆدێ) گوندێکە لە ڕۆژهەڵاتی [شاری] سلێمانی.

خوالێخۆشبوو شێخ سەعیدو خانەوادە ڕێزدارەکەشی چەند نەیارێکی شاراوەی هەبوو، چاوەڕێی هەلێکی گونجاویان دەکرد بۆ کارکردن بۆ نەهێشتنی ئەم دەسەلات و هەیبەتەیان، بەهەر ئاوایەک بوایە.

ڕاگەیاندنی دەستووری عوسمانی لە ساڵی (١٩٠٨) ئەم هەلەی بۆ ڕەخساندن، ئەوانیش خێرا قۆزتیانەوەو خستنەڕوونامە (مضبطة)یەکیان بۆ ئەنجومەنی وەزیران (الباب العالي) لە ئەستەمبۆڵ بەرزکردەوە، یەکێکیشیان بۆ مەڵبەندی ویلایەت لە موسڵ[١] لە دژی خوالێخۆشبوو شێخ سەعید نارد، ئەنجومەنی وەزیرانیش کە لە بارێکی ناهەمواردابوو لەبەر پیاوانی کودەتاکە فەرمانی بۆ خوالێخۆشبوو شێخ سەعید دەرکرد کە دەبێت شارەکەی [سلێمانی] بەجێ بهێڵێت و لە شاری موسڵ ئامادەبێت بۆ ئەوەی بەشێوەیەکی زۆرەملێ لەوێ ژیان بەسەر بەرێت.

خوالێخۆشبوو شێخ سەعید ملی بۆ فەرمانەکە کەچ کرد، -کەچی دەیتوانی هەڵوێستێکی پێچەوانەی وا بنوێنێت کە ئەنجامی دەرهاوێشتەکانی نەزانراوبن-، لەگەڵ هەندێک خزم و منداڵ و خزمەتکارەکانی هاتە موسڵ و چووە نێو خانووەکەی خوالێخۆشبوو «ئەلحاج محەمەد پاشا ئەلسابونچی»، کە دەکەوێتە شەقامی (سەرا[*]) -ئێستا ناوەکەی بووەتە شەقامی مەلیک فەیسەڵی یەکەم-، بەرامبەر قوتابخانەی ئامادەیی ئەلشەرقییە (إعدادية الشرقية)کەی ئێستایەو لە نزیک خانووەکەی خوالێخۆشبوو «خدری هەمەوەندی» کە لە خێڵی (ڕەشاوەندی)ی کوردە، خزمەتکارەکانیشی چوونە نێو خانووەکەی هاوسێی، کە ئەویشیان هەر هی خوالێخۆشبوو «ئەلسابونچی» بوو.

---

(١) ئەوکات ویلایەتی موسڵ ئەم لیوایانەی لەخۆ دەگرت: موسڵ، هەولێر، کەرکوک، سلێمانی.

(*) [(سەرا) وشەیەکی تورکییە واتە (کۆشک/تەلار)، بەلام لێرەدا بەمانای (باڵەخانەی حکومەت) دێت- وەرگێڕ]

## شتێک لەبارەی ڕەوشتی خەڵکی موسڵ

پێش نیو سەدە

بەلەبەرچاوگرتنی گەشەسەندنی ڕەوش و بارودۆخ، وا چاکە پێش ئەوەی بچینە نێو کرۆکی بابەتەکەوە کەمێک بادەینەوەسەر ڕەوشتی خەڵکی موسڵ پێش نیو سەدە.

هاوڵاتییانی موسڵ کۆمەڵێک دابونەریت و خووڕەوشتی چاکیان هەبوون، کە لە پێشینانیان هەر لە سەردەمی بڵاوبوونەوەی ئیسلام (الفتح الإسلامي)ەوە بۆ ماونەتەوە، پارێزگاریشیان لێ کردوون، سەرەڕای بەسەرچوونی سەردەمانێکی زۆرو گۆڕانکاریەکان خۆیان هەر پێوەگرتووە.

لە بەرچاوترین ئەو خووڕەوشت و دابونەریتانەش؛ ڕاستگۆیی، ئەمەکداری، متمانەیی، مەردایەتی و لەبەرچاوگرتنی مافی هاوسێ، خۆبەستنەوە بەئایین و پارێزگاری کردن لە بنەماکانی ئیسلام، لە کارو کردەوەکانیشیاندا دەستپاک بوون، دەستکراوەش بوون لە یارمەتیدانی دەستکورت و ئەوانەی ڕۆژگار ڕۆژانی سەربەرزییانی بۆ بێ دەسەڵاتی و، دەوڵەمەندییانی بۆ نەبوونی گۆڕیوە، هەروەها پەیڕەوی ئەم فەرموودەی پێغەمبەریان دەکرد: (إرحموا عزيز قومٍ ذل) واتە (بەزەییتان بێت بەئازیزی گەلێک گەر بێ دەسەڵات بوو).

سەبارەت بەبەدڕەوشتیش زۆر بەئاگابوون، پاراستنی ئابڕوو (شرف)ی ئافرەت، لەو پرسانەبوو کە لەنێو دەروونیاندا شوێنێکی هەرە بەرزی هەبوو، دوانەدەکەوتن لە بەخشینی گیانیان بەهەرزانی لە پێناو کەمترین ئاماژەی دەستوەردان لە ئابڕوو و سەربەرزیەتی، خۆشیان بەدوور ناخەن لە یارمەتیدانی یەکتری ئەگەر پێویستی کرد. چونکە ئێرەییان بەئابڕووی خەڵکی تریش هەڵدەچوو وەکو چۆن بۆ خۆیان هەڵدەچێت، توندڕەوییان لەم بارەیەوە بەڕادەیەک بوو خۆیان دەپاراست لە ناوهێنانی ئافرەتان لە بەرامبەر کەسانی بیانی، بەڵکو ئەم توندڕەویەیان ئەوانی گەیاندە ڕادەی بەرپاکردنی شۆڕشێکی گەورە لەم شارەدا پێش نیو سەدە کاتێک حکومەت

ویستی سەرژمێریەکی گشتی بۆ نێر و مێ ئەنجام بدات، هەر بەهۆی ئەم شۆڕشەوە هەوڵیاندا هەندێک لەو کەسایەتی و کارمەندانەی ئەرکی جێبەجێ کردنی ئەو تۆمارکردنەیان پێ سپێردرابوو لەناوببەن و، ماڵی هەندێکیشیان تالان کرد، توانیشیان ئەگەر بۆ ماوەیەکی کەمیش بێت تۆمارکردنەکە بۆ ساتێکی تر دوابخەن.

زۆریش تامەزرۆی دەستخستنی ئەسپی رەسەن و پەروەردەکردنیان بوون، هەر بەهۆی ئەمەشەوە زۆرێکیان ببوونە سوارچاکی لێهاتوو.

چەندین گۆڕەپانی پێشبڕکێشیان هەبوو، گرنگترینیان: زەویەکەی تەنیشت رووباری دیجلە، نێوان شوێنی (قەرە سەرای)و شوێنی (باشطابیة)ی رووبەڕووی کانی کبریت (عین کبریت). بەڵام دوای ئەوەی ئاو ئەم شوێنەی داپۆشی، گواستیانەوە بۆ شوێنی غزلانی (موقع الغزلانی)و ئەو زەویە پان و بەرینەیان کردە شوێنی پێشبڕکێی ئەسپەکان، ئەم زەویەش ئێستا بە(أرض المنطرد ) ناودەبرێت.

ئەم پێشبڕکێیەش رۆژانی هەینی ساز دەکرا، بەڵام رۆژانی جەژن بەشێوەیەکی بەرفراوانتر دەکراو، هەموو خاوەن ئەسپەکانی شار، هەروەها هەندێک سوارچاکی گوندەکانی دەوروبەریش تیایدا بەشدار دەبوون و جەماوەرێکی زۆری خەڵکیش ئامادەی دەبوون.

ئەم پێشبڕکێیانە وەکو ئێستا بەمەبەستی گرەو (قومار) لەسەرکردن نەبوون، بەڵکو بەمەبەستی پاراستنی هونەری سوارچاکی بوو، کە لە باب و باپیرەکانیانەوە بۆیان بەجێماوە، هەروەها بۆ روونکردنەوەو دیارخستنی گرنگی ئەم هونەرە بوو لەلایەن پاڵەوانە سەرکەوتووەکان و، دیارخستنی توانای ئەسپە رەسەنە عەرەبییەکان لەنێو خەڵکیدا.

خەڵکی لە رۆژانی جەژن خۆیان بەجوانترین شێوە دەڕازاندەوەو بەیانی زوو لە ماڵەکانیان دەهاتنەدەرو بەرەو مزگەوتەکان بەرێ دەکەوتن بۆ بەجێگەیاندنی نوێژی جەژن، پاشان زۆرێکیان دەچوونە گۆڕستانەکان بۆ سەردانکردنی مردووەکانیان و، بۆیان دەپاڕانەوە و داوایان لە خودا دەکرد

بەدلۆڤانیی خۆی بییان بەخشێ، ئینجا دەگەڕانەوە ماڵەکانیان بۆ پێشوازیکردنی میوانەکان و، خۆشیان سەردانیان دەکردنەوە. هەروەها حەلوا و قاوەو جگەرەیان پێشکەش دەکردن. هەندێکیان (ئەلقەلاوین)یشیان -کە بۆ کەسانی تایبەت ئامادە دەکرا- پێشکەش دەکردن.

خەڵکی کۆمەڵ بەکۆمەڵ روویان لە نێو شارو دەوروبەری دەکرد، لەملاو لەولا بەدڵخۆشی و شادومانییەوە یەکتریان ماچ دەکردو، سڵاوو تۆقەیان لەگەڵ یەکتر دەکرد. ئەمەش بەبێ جیاوازی لەنێوان نەیار و دوژمن و خزم و هەڤاڵە ناسراوەکانیان رووی دەدا. بەمەش دڵە لێکشکاوەکانیان چاک دەبوونەوەو رق و کینەش لەنێو دەروونە لێکتۆراوەکان نەدەماو تەبایی و خۆشەویستیش لەنێوان خزم و هەڤاڵ و خۆشەویستان زیاتر دەبوو.

لە موسڵ چەند شوێنێک هەبوون لەنێو شوورەی شارەکەو دەرەوەی، رۆژانی جەژن خەڵکی روویان تێ دەکرد. لەوێ چەرخ و فەلەک و جۆلانەی لە دار دروستکراو لەو رۆژانە ئامادە دەکران بۆ رابواردنی منداڵان، ئەو شوێنانە پڕ دەبوون لە فرۆشیارە گەڕۆکەکانی شیرینەمەنی و شتی تر. قەرەباڵغترین ئەو شوێنانەش لە رۆژانی جەژن؛

ناوچەی باب ئەلتۆپ بوو، کە خەڵکی لە هەموو دەرو شوێنێکەوە روویان تێ دەکرد، پیاوو ئافرەت، گەورەو بچووک، بەڵام ئافرەتان لە شوێنێکی تایبەت و جیا لە کۆمەڵی پیاوان کۆم دەبوون، چونکە باری کۆمەڵایەتیی ئەوکات رێی بەتێکەڵاوبوونی هەردوو رەگەزەکە نەدەدا، یارمەتی نێرەکانی نەدەدا خۆیان بخزێننە نێو ریزی مێیەکانەوە. هەر یەکێکیش لەم رێسایە لایدابوایە، جا خاوەن هەر پلەو پایەیەک بوایە، ناچاربوو بەرگەی دەرئەنجامەکەی بگرێت، کە تێهەڵدان و سووکایەتی پێ کردنە، لەوانەیە لێدان و شلاقیشی لەگەڵدا بێت. چونکە کارێکی ناکۆکی لەگەڵ پاکیەتی کردووەو، نەریت و رەوشتی بەرزو ئیرەیی کولاوی نێو دەروونەکانیش پەسەندی ناکەن.

## کورتە باسێکی ناوچەی باب ئەلتۆپ

ناوچەی باب ئەلتۆپ (باب الطوب(*)) کە خەڵکی لە پێش نیوسەدە ڕۆژانی جەژنەکانیان تیادا بەسەردەبرد، ئەم باڵەخانانەی ئێستا(**) دەیان بینین ئەوکات لێی نەبوون، بەڵکو چەند باڵەخانەیەکی کەمی لێ بوو بەپەنجەی دەست دەژمێردران، لەو باڵەخانانەش؛

خانووی حەمۆ قەدۆ (خان حمو القدو)، کە کرابووە بەڕێوەبەرایەتی بۆ (بانقی عوسمانی)، بەڵام ئێستا بازاڕی گەنم فرۆشتنە (سوق الحنطة). هەر لە تەنیشتیشییەوە خانووی خوالێخۆشبوو «مستەفا بەگ»ی قایمقامێکی سەربازی(***) بوو. هەروەها خانووی تەعقیم کردن (تبخیرخانە)، کە ئێستا باڵەخانەی بانقی عوسمانی (البانق العثماني)ی شوێنی گرتۆتەوە، ئینجا باڵەخانەیەک بۆ فرۆشتنی نەفتی ڕەش (خان النفط) لە نزیک دەروازەی بازاڕی قەسابەکان (سوق القصابین)ی ئێستا -کە ئەوکات هێشتا دروست نەکرابو- هەبوو. ئینجا باڵەخانەی ئەلزەبتییە (الضبطیة(****))، کە پێی دەگوترا (طاولة الضبطیة)، ئێستاش باڵەخانەی فەرمانگەی پۆلیس (دائرة الشرطة) شوێنی گرتۆتەوەو باڵەخانەی فەرمانگەی شارەوانی (دائرة البلدیة)شی لە بەرامبەر بوو، کە

---

(*) [(باب الطوب = BAB AL'TOP) لە دوو وشە پێکهاتووە؛ یەکەمیان (باب) وشەیەکی عەرەبییە واتە (دەرگا). دووەمیشیان (الطوب) لە وشەی (تۆپ)ی کوردی و تورکییەوە وەرگیراوە، کە ناوی چەکێکی گەورەو گرنگی ئەوسابووە. بەم پێیە واتای (دەرگای تۆپ) دەبەخشێت. بڕوانە پەرتووکی (جَمال بابان: أصول أسماء المدن والمواقع العراقیة، ج ١، مطبعة المجمع العلمي الکردي، بغداد ١٩٧٦، ص ٣٢٣و ٣٢٤)- وەرگێڕ].

(**) [مەبەستی نووسەر لە (ئێستا) ساڵی (١٩٥٥)ە، واتە ساڵی لەچاپدانی ئەم پەرتووکە- وەرگێڕ]

(***) [(قایقامی سەربازی) هاوپلەی (عەقید/سەرهەنگ)ی ئێستایە- وەرگێڕ].

(****) [لەسەردەمی عوسمانییەکان بە(پۆلیسخانە) دەگوترا (الضبطیة)- وەرگێڕ].

ئێستا کۆمەڵە دوکانێکی لێ دروستکراوەو شوێنێکی بازرگانییە، سەرەوەشی قاوەخانەیەکی گەورەیە، لە تەنیشتیشی باڵەخانەی دادگای شەرعی (المحكمة الشرعية)بوو، کە ئێستا لە شوێنی ئەو و پارچە زەوییێکی شوورەی کۆنی موسڵ باڵەخانەی بانقی رۆژهەڵات (ئێستـرێن بانک)ی لێ دروستکراوە. باڵەخانەی بەندیخانە (بناية السجن)یش لە شوێنی ئێستای باڵەخانەی بانقی رافیدەین (بناية بانق الرافدين)بوو، پارچە زەوییێکی بچووکیشی لە بەرامبەر بوو کارمەندانی بەندیخانە بۆ خۆیان کردبوویانە باخچە، کە ئێستا باڵەخانەی پۆستەو بروسکە (البريد والبرق)ی لەسەر دروستکراوە.

لە پانتاییەکی فراوانی گۆڕەپانەکەی باب ئەلتۆپ (ساحة باب الطوب) گۆڕی گەلێک مردووی موسڵمانی تێدابوو، بەڵام ئێستا تەنها کەمێکیان شوێنەواریان ماوە، چونکە خەڵکی لەم ساڵانەی دواییدا دەستیان بەسەرداگرتووەو دوکان و گەراج و گەرماوو میوانخانەو شتی تری کە ئێستا دەبینرێن، لەسەر گۆڕەکان دروستکردووە.

هەرچی رێگاکانیشە، ئەوانەی گۆڕەپانی باب ئەلتۆپ چەقی لقبوونەوەیان بوو، ئەمانەن: رێگای بازاڕی پەڕچییەکان (سوق الصوافة)و رێگای (سەرای) -شەقامی مەلیک فەیسەڵی یەکەم-و رێگای مزگەوتی شێخ عومەر و رێگای دەرگای لکش (باب لكش)و رێگای (نەبی شیت)و، رێگایەکی سەرەکی بۆ ناوەوەی شارەکە، کە لقێکی دەچێتە گەرماوی ساڵحییە (حمام الصالحية)و رێگاییێکیش بۆ بازاڕی (باب السَراي)، ئەو شەقامەی ئێستا بەناوی شەقامی غازی (شارع غازي)یە ئەوکات نەبوو. رێگایەکی تریش بۆ مزگەوتی خوزام (جامع خُزام)، لەگەڵ چەندەها رێڕەوی تری تەنگەبەرو بچووک.

**پریشکەی ئاژاوەکە لە باب ئەلتۆپ**

هاولاتییان رۆژی یەکەمی جەژنی قوربانیی ساڵی ١٣٢٦ک. [١٩٠٨ز.] بەخۆشی و ناخۆشیەکانیەوە بەڕێ کرد. بەرەبەیانی رۆژی دووەمیش ئەو شادومانیەی کە سروشتی جەژنەکە رەخساندبووی دەستی پێ کردەوەو، بەرەبەرە جموجۆڵ کەوتەوە شەقام و فرۆشگاو گەڕەکەکانی شارو پەیتا پەیتا خەڵکی لە شوێنە گشتیەکان کۆم دەبوون، لەنێویان گۆڕەپانی باب ئەلتۆپ. بەختی ئەم گۆڕەپانە لە حەشامەتی هاولاتییان -پیاوو ئافرەت، گەورەو بچووک- بەڕادەیەکی گەلێک زۆر بوو. ئافرەتەکان -کە بێگومان داپۆشراوبوون- لە لایەکی تایبەتی گۆڕەپانی باب ئەلتۆپ کۆم دەبوون، کە نزیک بوو لە خانووەکەی «مستەفا بەگ»ی قایمقام وەک پێشتر ئامادەمان بۆ کرد. پیاوەکانیش دەهاتن و دەچوون. گەنجەکانیش دڵخۆش و شادومان بوون، منداڵەکانیش هەڵدەپەڕین و یارییان دەکرد. چەرخ و فەلەکەکانیش بەسەرنشینەکانیانەوە بەبێ وەستان دەخولانەوە. جۆلانەکانیش بەبێ وەستان راست و چەپ دەجوولان. فرۆشیارەکانیش لەوێ یەک بەدەنگیان هاواریان دەکرد بۆ فرۆشتەکانیان.

ئەوسا کەس نەبوو هزری بۆ ئەوە بچێت، کە ئاژاوەیەکی نووستوو بەئاگا دێت و ترس و زەندەقچوون لەناو دەروونی خەڵکی بڵاودەکاتەوەو، خۆشیەکانیان دەکاتە تاڵی و، دەبێتە هۆی نانەوەی کوشتار لە نێوان دوو لایەنی موسڵمان، تیایدا خوێنی چەند بێ گوناهێک دەڕێژرێ و گیانەکان دەکێشرێن بۆ ئەوەی بچنەوە لای پەروەردگاریان و، گلەیی و سکالای خۆیان لە بارەی سەرکێشی و لەخۆبایی بوون و دڕندەیی مرۆڤ و لەبەینبردن و ستەمی مرۆڤ لە برای خۆی بۆ بکەن.

بەیانی ئەو رۆژە، من لەگەڵ هەندێک لە منداڵانی خزمان و کوڕانی گەڕەک، بەرەو باب ئەلتۆپ دەرۆیشتین، تەمەنی گەورەترینیشمان لە هەشت ساڵ زیاتر نەبوو. لەوکاتەی بەپێش باڵەخانەی بەندیخانەدا تێ دەپەڕین، پێش ئەوەی بگەینە شوێنی (طاولة الضبطية)، خەڵکمان بینی

رادەکەن. بوو بەهات و هاوارو چەند دەنگێکیش بەرزبوونەوە: *بڵاوبنەوە. بگەڕێنەوەماڵەکانتان!. جەندرمە و خەڵکی لە باب ئەلتۆپ شەڕیانە!. کوا غیرەت!. کوا نامووس؟. ئەم شەڕە لەسەر چییە؟. لە چییەوە سەری هەڵداوە؟.*

شێخ مەحمود و براکەی خوالێخۆشبوو شێخ ئەحمەد کوڕانی خوالێخۆشبوو شێخ سەعیدو، سەرۆکی نووسەرانی فەرمانگەی (الريجي - انحصار التبغ)، خوالێخۆشبوو بەها ئەفەندی کوڕی عەبدوڵڵا ئەفەندی کوڕی حاجی ئیبراهیم ئەفەندی، کە بەبنەچە خەڵکی کفری (الصلاحية)یە، هەمووشیان لە تافی لاوێتی دا بوون، لە ماڵی خوالێخۆشبوو مستەفا بەگی قایمقامی سەربازی بوون، لەسەر بەلەکۆنی خانووەکەیەوە -کە رووبەڕووی گۆڕەپانی باب ئەلتۆپ بوو- تەماشای حەشامەتی خەڵکی و خۆشیەکانی جەژنیان دەکرد. دوای ئەوەی ماوەیەکیان لەوێ بەسەربرد، هاتنە نێو گۆڕەپانی باب ئەلتۆپ و، ماوەیەک پیاسەیان کرد، پاشان لەسەر رێی خۆیاندا چوونە ئەو لایەی ئافرەتی لێ کۆم ببوونەوە، کاتێک گەیشتنە لایان، بەها ئەفەندیی ناوبراو -کە سەرخۆش بوو- خۆی بەکۆڵی ئافرەتێک دادا، ئەویش هاواری فریاکەوتنی کرد. دوای ئەو ئافرەتەکانی تریش هاواریان کرد، لەبەر ئەم هات و هاوارە پیاوەکان بەپەلە بەهانای شوێنی هاوارەکەوە چوون. کاتێک راستیی کێشەکەیان بۆ روونبووەوە هەڵچوون. هەندێکیان بەرپەرچی «بەها ئەفەندی»یان دایەوە، ئەویش جوولەیەکی کرد، کە بەتێڕوانینی خەڵکی ئەوسا تاوانێکە لێخۆشبوونی بۆ نییە. بۆیە ئەم گەنجەو، ئەوانەی لەگەڵیدابوون شێوان و شڵەژان. هەر ئەوەندەیان پێ کرا بگەڕێنەوە بۆ ئەو خانووەی لێیەوە هاتوون، دەرگاشیان بەرووی خەڵکیدا داخست و هەندێکیشیان دەستیان بەتەقەکردن کرد لە خەڵکی بۆ ترساندنیان.

چەند جەندرمەیەکیش لە قاوەخانەکەی «ئەبو عەباس»بوون، لە دژی خەڵکی ئامادەبووی گۆڕەپانی باب ئەلتۆپ هەڵسان بەردیان لە یەکتری گرت و بووە شەڕەدارو ئەو شەپکانەی لە ئاوهەڵێنجەکان (النواعير)و

دوکـانەکـان کـرانەوە. ئەمـەش هاوکـات بوو لەگـەڵ هاتنی گـەڕوانە (دورية)یەکی جـەندرمـەی ئێـسـتـرسـوار بۆ شـوێنی ڕووداوەکـە، ئـەوانیش یەکسـەر چوون بۆ (طاولة الضـبطيـة)و ئێـسـتـرەکانیان لەوێ بەستنەوەو گەڕانەوە بۆ سەرخستنی هاوڕێیەکانیان لە شەڕەکەیاندا دژی خەڵکی. لەم شـەڕەشـدا تفـەنگ و دەمـانچـەیان بەکـارهێنا، ژمـارەی ئەو جـەندرمـانەی بەشـدارییـان لە پێکدادانەکـەدا کـردبوو گـەیشـتـبـووە چل کـەس. لە لایەنی خەڵکی دەستبەتاڵ و بێ چەکیشەوە ژمارەیەکیان کوژران و برینداربوون.

دوای ئەوە، کاتێک کۆمەڵە پیاوێکی چەکدار لە ناوەوەی شارەوە هاتنە گۆڕەپانی پێکدادانەکە جەندرمەکان هەڵاتن بۆ نێو بارەگاکەیان لە (طاولة الضـبطيـة)، کـە ژمـارەیەکی تری جـەندرمـەی -نزیکـەی سـەد کـەسـێک دەبوون- تێدابوو.

ئـینجـا دوای داخـسـتـنی دەرگـای باڵەخـانەی (طاولـة الضـبطيـة)، جەندرمەکان لە نێو حەشارگەکەیاندا دەستیان بەتەقـە کرد لەو خەڵکەی دەوریان دابوون. چەند هاوڵاتییەک بریندار کران. گـوللەی خەڵکیش هیچ کاریگەرییەکی لە جەندرمەکان نەکردو زیانـی پێ نەگەیاندن، بۆیە کۆمەڵە چەکدارێک سەرکەوتنە سەر باڵەخانەکانی دەوروبەر، وەکو: باڵەخانەی شـارەوانی و باڵەخـانەی دادگـای شـەرعی و باڵەخـانەی نەفت فـرۆشتن و گەرمـاوی ساڵحییەو، دەسـتیان بەتەقـە کـرد لە جـەندرمەو هەر یەکـێکی بەرچاویان کەوتبا. تەنانەت هەندێکیان سـەرکـەوتنەسـەر بانـی ژوورێکی خودی باڵەخانەی (طاولة الضبطية)و کونێکیـان لە ساپیتەکەی کردەوەو کرایە ئامانجێک بۆ تەقە لێکردن. ئەو ژوورەش هەندێک دەفتەرو تۆمارگەو رووپەڕی فەرمیی تێدابوون بەهۆی کلّپەی گوللەکان ئاگریان تێبەربوو. دە کەسیش لە جەندرمەکان کوژران. بارودۆخەکە تا نیوەشەو بەم شێوە مایەوە، ئەوکـات جەنگاوەرە هاوڵاتییـەکان گەڕانەوە مـاڵەکـانیان بۆ تەواوکـردنی پاشـمـاوەی شـەو، بەڵام چەند کـەسـێکیـان لەوێ بەجـێهـێشـتن بۆ چاودێریکردنی گەمارۆدراوەکان نەوەکو لەشەودا هەڵبێن.

بەیانی ڕۆژی دواتر -کە سێیەم ڕۆژی جەژن بوو- کاتێک جەنگاوەرەکان

هاتنەوە بینییان باڵەخانەی (الضبطیة) چۆڵ بووە لەو جەندرمانە، کە سوودیان لە لاوازیی پاوسەوانیەتی و چاودێری وەرگرتبوو و لەوێوە هەڵاتبوون بۆ سەرای حکومەت. ئەم جەنگاوەرانەش کە زۆرێک ئاژاوەچی و گێرەشێوێنییان لەگەڵدابوون بەرەو سەرای حکومەت چوون و داوایان لە والی -فەریق پاشای حەلەبی والیی موسڵ بەوەکالەت- کرد، کە ئەو جەندرمانەی شەڕیان لەگەڵدا کردبوون بەدەستەوەیان بدات تاکو تۆڵەی خۆیانیان لێ بکەنەوە، بەڵام کاتێک کە زانییان داواکەیان ناپەسندە -کە بێگومان هەر واشبوو- داوای کوڕەکانی خوالێخۆشبوو شێخ سەعیدو بەها ئەفەندی عەبدوڵلایان کرد، چونکە نەیانتوانیبوو هەر لە یەکەم رۆژی رووداوەکە لەناویان بەرن. وەڵامی والییش ئەوەبوو کە ئەو کەسانەی دەتانەوێن لای من نین، دەشتوانن بچن لێیان بنۆڕن، بەڵام لە شوێنانی تر نەک بەڕێوەبەرایەتییەکانی حکومەت. هەر ئەوکات پڕوپاگەندەیەک لەنێو خەڵکە کۆبووەکە بڵاوبوەوە کە:

ئەو کەسانەی ناویان هێنرا وا لەنێو ماڵی «شێخ سەعید»ن.
ئەو دەستدرێژیەی لە باب ئەلتوپ کراوتە سەر خەڵکی سەرچاوەکەی کوڕەکانی «شێخ سەعید»بوون.

لە ژێر کاریگەری ئەم پڕوپاگەندە هەڵبەستراوە و پێش ئەوەی راستییەکەیان بۆ روون بێتەوە، بەرەو ئەو خانووەی «شێخ سەعید»ی تێدا دەژیا چوون و گەمارۆیان دا. کاتێک والی ئەم هەواڵەی بیست، فەرمانیدا هەر یەکێک لە خوالێخۆشبوو رەشید ئەفەندی ئەلعومەری و خوالێخۆشبوو شێخ ئیبراهیم ئەفەندی ئەلرۆمی و عەلی ئەفەندی ئەلئیمام -پێشنوێژی مزگەوتی نەبی شیت- بچن بۆ شوێنی حەوانەوەی شێخ سەعید و بیهێنن بۆ بارەگای والی لە (سەرای) تاکو هیچی بەسەر نەهێت و زیانی پێ نەکەوێت. ئەم زاتانەش چوونە ئەو خانووەی خوالێخۆشبوو شێخ سەعیدی تێدا دەژیاو، ئارەزووی والییان پێ راگەیاند کە دەبێت ماڵەکەی بەجێ بهێڵێت و لە سەرای حکومەت ئامادەبێت تاکو لە ژێر چاودێریدا بێت،

دڵنیاشیان کرد لەسەر ژیانی خۆی. ئەویش گوێڕایەڵی کردن دلۆڤانیی خودای لەسەر بێت بەدوودڵی هاتەدەرو لەگەڵ ئەم زاتانە ڕۆیشت، قورئانی پیرۆزیشی بەدەستەوە بوو و خەرقە (جبة) کەسکەکەشی لەسەر شان بوو، -دەشڵێن خزمەتکارەکەی قورئانی پیرۆزی هەڵگرتبوو و لە پێشەوەشی دەرۆیشت-، چەند سەربازێکیش لەدوایانەوە بوون لەگەڵ هەندێک خەڵکی کۆبووەوە.

کاتێک گەیشتنە شوێنی (سەبیلخانە[1])ی نزیک دەروازەی سەرای حکومەت، بەفەرمانی تەوفیق بەگ (طابور ئاغاسی) -کە لەنێو خەڵکی موسڵدا بە(دارەکە بێنە[2]) بەناوبانگ بوو- دەرگای سەرای لە رووی هاتووەکان داخرا.

کاتێک هاوڵاتییان ئەم هەڵوێستەیان لە (دارەکە بێنە) تێبینی کرد، یەکێکیان بەردێکی گەورەی هەڵگرت و لە پشتەوە دا بەسەری شێخ سەعید. لەگەڵ لێدانەکە بەربووەوە، دلۆڤانیی خودای لەسەر بێت لە هۆش خۆی چوو، پاشان گیانی لەدەستدا. هەندێکی تریش هێرشیان کردەسەر خزمەتکارەکەی و ئەویشیان کوشت. گێڕانەوەکانیش جیاواز بوون لەمەڕ کێشەی داخستنی دەرگای سەرای حکومەت بۆ بوارنەدانی چوونە ژوورەوەی خوالێخۆشبوو شێخ سەعید بۆ چاوپێکەوتنی بریکاری والی فەریق زەکی پاشای حەلەبی هەروەک خۆی داوای کردبوو. لەوانەشە ئەم کردەوەیە نهێنییەکی تێدا بووبێ و بەشەو نەخشەی بۆ کێشرا بێت. هەر چۆنێک بێت، ئەوا گیانی پاک و بێ گوناهی شەهید شێخ سەعید بەو شێوە چەپەڵە

---

(١) گۆزەیەکی گەورەی لە قوڕ دروستکراوە (کووپ)ی ناوە، هەموو ڕۆژێک پڕی ئاو دەکرا، ڕێبوارو موراجیعەکانی سەرای حکومەت لە کاتی تینووبوونیان ئاویان لێ دەخواردەوە.

(٢) (دارەکە بێنە) وشەیەکی کوردییە، کورتکراوەی (دارەکەم بۆ بهێنە)یە، تەوفیق بەگی ناوبراو ئەم وشەیەی بەو جەندرمانەی لەگەڵیدابوون دەگوت، هەر کاتێک ویستیبوایە بەندکراوێک یان هەر کەسێکی تر دارکاری بکات، بۆیە بەم وشەیەوە ناوبانگی دەرکردبوو و ببووە نازناوێکی باوی ئەو. ناوبراو خەڵکی سلێمانییە.

دەرهێنراو چووە لای خودا گلەیی ستەمدیەیی خۆی بۆ بکات، خوداش بێ ئاگا نییە لەوەی ستەمکاران دەیکەن. ئەمەش لە کانوونی یەکەمی ساڵی (١٩٠٨) کە رێککەوتە لەگەڵ رۆژی (١٢) دوازدەهەمینی (ذي الحجة)ی ساڵی (١٣٢٦)ی کۆچی روویدا، پێکدادانەکەش لە رۆژی دووەمی جەژنی قوربانی دەستی پێ کردو بەشەهیدکردنی خوالێخۆشبوو شێخ سەعید لە رۆژی سێیەمی کۆتایی هات[١].

بەڵام هەندێک لەو گێرەشێوێنانەی خەڵکی موسڵ بەم کارەش نەوەستان، بەڵکو دووبارە بەسەر ئەو خانووەی خوالێخۆشبوو شێخ سەعیدی تیادا دەژیا دادایەوەو هەڵیان کوتایەوە سەری و خوالێخۆشبوو شێخ ئەحمەدی کورەکەشیان کوشت[٢]. شێخ مەحمودی برایشی خۆی لە ماڵی «خدری

(١) لە لاپەڕەی (٥٨)ی پەرتووکی (تأريخ العراق القريب)دا -کە لە نووسینی (مس بیڵ)ەو مامۆستا جەعفەر خەیات وەریگێڕاوەتە سەر زمانی عەرەبی- هاتووە کە خوالێخۆشبوو شێخ سەعید لە کانوونی دووەمی ساڵی (١٩١٠) لە مووسڵ و بەشێوەیەک کە هێشتان رووی راستەقینەی رووداوەکە روون نەبۆتەوە کوژرا. من دەڵێم: راستییەکەی هەروەکو پێشتر باسمان لێوەکرد، مێژووی ئاژاوەکە لە کانوونی یەکەمی ساڵی (١٩٠٨) بوو نەک کانوونی دووەمی ساڵی (١٩١٠)، بارودۆخەکەشمان لە لێکۆڵینەوەکەماندا روون کردۆتەوە. لە لاپەڕەی (١١٩)ی بەرگی سێیەمی پەرتووکەکەی خوالێخۆشبوو مامۆستا محەمەد تاهیر ئەلعومەری بەناوی (تأريخ مقدرات العراق السياسية)دا هاتووە کە پێکدادانەکە لە رۆژی یەکەمی جەژنی قوربانیدا بووەو سێ رۆژ بەردەوام بووە بەبێ ئەوەی حکومەت توانای دامرکاندنەوەی هەبووبێت، سەرەڕای هاتنەناوەوەی (مُداخلة) پۆلیس و سەربازەکان. ئێمەش دەڵێین: پێکدادانەکە لە دووەمین رۆژی جەژن دەستی پێکردو تەنها دوو رۆژ بەردەوام بوو، پۆلیس وسەربازەکانیش بەهیچ شێوەیەک نەهاتنەناو ئەم کێشەیە.

(٢) تەرمی شەهید شێخ سەعید لەو گۆڕستانەی بەمزگەوتی نەبی شیت (س) وەنووساوە نێژرا. شێخ ئەحمەدی کوڕیشی هەر لە تەنیشتیەوە نێژرا. لەم دواییەش چەند گڵکۆو سەکۆیەکیان لەسەر دروست کران. رێزدار عەلی غالبی بەڕێوەبەری پۆلیسی موسڵیش لە سەردەمی دەستبەکاربوونیدا نوێی کردنەوە. ئێستا خەڵکی بەمەبەستی نزاو پاڕانەوە سەردانی گۆڕی خوالێخۆشبوو شێخ سەعید دەکەن.

هەمەوەندی»ی هاوسێیان شاردبۆوەو لەوێشەوە توانی خۆی بگەیەنێتە ماڵی خوالێخۆشبوو «ئەلحاج محەمەد چەلەبی ئەلجادر» کە لەوێوە نزیک بوو. لەوێشەوە خانەخۆکانی ماڵەکە ئەرکی شاردنەوەو گەیاندنی بۆ باڵەخانەی حکومەت گرتە ئەستۆ.

ئینجا هەندێک خەڵکی-کە «یەحیا بن ئەیوب ئەلحاویس» پێشڕەوی دەکردن- سووڕانەوە سەر خانووەکەی ئەلسابونچی (خان الصابونجی) و دەرگایان شکاند و هەندێک پیاوی شێخ سەعیدیان تێدا دۆزینەوە و کوشتیانن، گشت کەلوپەلەکانیشیان تاڵان کرد -کە موڵکی خوالێخۆشبوو محەمەد پاشا ئەلسابونچی بوون.

لەوێشەوە بەرەو باب ئەلتۆپ چوون وماڵی قایمقام «مستەفا بەگ»یشیان تاڵان کرد. سەرەنجام «بەها ئەفەندی عەبدوڵلا»یان هەر نەدۆزیەوە، کە خۆی لە شوێنێکی نادیار حەشاردابوو. ئەو جەندرمە و ئێسترسوارانەی ئاژاوەکەشیان نابووەوە رزگاریان بوو. ئەوەی دەستیشی نە لە هۆکارو نە لە تەشەنەپێدانیشی هەبوو، شەهیدبوو و گەڕایەوە لای خودای خۆی، (واتقوا فتنة لا تصيبن الذين ظلموا منكم خاصة) واتە (خۆتان دوورخەن لەو ئاژاوەیەی کە تووشی ستەمکارەکانتان بەتایبەتی نەبێت).

**هەڵوێستی موسڵ (موسڵییەکان) لەم رووداوە دەڵتەزێنانەدا**

چەند راستییەک هەیە پێویستە بزانرێ. رووداوەکانی جەژن کە بوونە هۆی دەستدرێژی کردنەسەر خوالێخۆشبوو شێخ سەعیدو کوشتنی، ئەوانەی پێی هەڵسابوون چەند کەسێکی دیاریکراوی خەڵکی موسڵ بوون، بەڵام زۆربەی هەرە زۆری دانیشتوانەکەی بەشدارییان تێدا نەکردبوو و دەستیان لە وردەکاریەکانی رووداوەکەدا نەبوو، بەڵکو لە کاتی ئەو رووداوانەدا گەڕابوونەوە ماڵەکانیان و بەپشوویەکی درێژەوە چاوەڕێی رێوشوێنی (ئیجرائاتی) پێویستی حکومەتیان دەکرد بۆ دامرکاندنی ئاژاوەکە، بەو پێیەی کە بەرپرسە لەم جۆرە بزاڤانەو لە دابینکردنی ئاسایش لە وڵاتدا. بەخەیاڵیاندا نەدەهات کە حکومەت لە بەرامبەریدا دەستەوەستان و

دوودڵ، تیکەڵاو بەشاراوەیی و بایەخپێنەدان دەوەستێت و واز لەو رق و کینە دەهێنێت بەکەیفی خۆی تەشەنە بکات، بەمەش بارەکە گرژتردەبێت و بەو دەرەنجامە غەمناکە دەگات.

هەڵبەت، ئەو خەڵکە زۆرەی کە لە ماوەی رووداوەکان گەڕابوونەوە ماڵەکانیان و دەرنەکەوتبوون، ئەگەر بیانزانیبوایە دەرەنجامەکەی کوژرانی شەهید شێخ سەعیدی لێ دەکەوێتەوە، لە ماڵەکانیان پاڵ نەدەکەوتن، بەڵکو دەهاتنەدەر بۆ خەبات و داکۆکی لێ کردن، تەنانەت ئەگەر موسڵ بەخوێنی رۆڵەکانی و لەسەر حیسابی کوشتنی یەکتریشیان نوقم بوایە. بەڵام کە کار لەکارترازا، بەڵاش قەوما، دادو فیغان و پەژاری سوودیان نابێت ئەگەر دادگەری رێڕەوی سروشتی خۆی نەگرێتەبەرو ستەمکاریش باجی کردەوەکەی نەدا. بۆیە هەندێکیان داوایان لە دەزگا بەرزەکانی حکومەتی خۆجێیەتی کرد کە رێوشوێنی پێداچوونەوەی یاسایی بەپەلە لە دژی ئەوانەی هۆکاری ئەو رووداوە خوێناویە بوون بگرێتەبەرو، ئەوانەی پشکدارییان تیایدا کردووەو ئەوانەی هانیشیان داون، جا پلەوپایەیان هەرچەندی بەرز بێ یان نزم بێت. هەرکەسێکیش تۆمەتەکەی لەسەر سەلمێندرا بەگوێرەی دادگەری و ویستی ویژدان توندترین سزا بدرێت.

**دەنگدانەوەی رووداوەکان لە کەرکوک و سلێمانی**

کاتێک هەواڵی ئەم رووداوانە بەشێوە خوێناوییەکەیەوە گەیشتە ناوچەی کەرکوک و سلێمانی، لەنێو دانیشتوان دەنگدانەوەیەکی گەورەی لێ بەرپابوو، بەتایبەتی تابعەکانی -واتە پەیڕەوکەرانی رێبازەکەی- شێخ سەعیدو موریدو لایەنگرەکانی لەنێو رۆڵەکانی شارو خێڵەکاندا، لە پێشەوەی هەمووشیانەوە خێڵی (هەمەوەند)ی بازووبەهێز، رق و تووڕەییان هەڵساو نیگەرانی بڵاوبووەوە و نائارامی دەمارەکانیانی گرت و دەروونیان هەڵچوو و زۆرێک لە خێڵەکان خۆیان سازکرد بۆ لە یاسا دەرچوون و یاخی بوون و شۆڕش کردن لە دژی حکومەت بۆ تۆڵەکردنەوەی خوێنی خوالێخۆشبوو شێخ سەعید.

بەڵام کە زانییان شێخ مەحمودی کوڕی خوالێخۆشبوو شێخ سەعید لەگەڵ هەندێک لە خزم و یاوەرەکانی ئەوانەی دەستی قەدەر پاراستبوونی لە موسڵ لەلایەن حکومەتەوە دەستبەسەرن، بیریان لەوە کردەوە کە مکوڕ بن لەسەر بەردانی ئەو دەستبەسەرانە پێش ئەوەی کارێکی وا بکەن ببێتە مایەی تێکدانی ئاسایش، بۆیە هەندێک لە پیاوماقووڵ و گەورەپیاوانی [شاری] کەرکوک داواکاریەکیان بۆ حکومەت بەرزکردەوەو تیایدا داوای بەردانی دەستبەسەرەکانیان کرد، لە سەروی هەمووشیانەوە شێخ مەحمود، ماوەیەکیشیان بۆ بەردانەکە دەستنیشان کرد، ئەگەرنا ئەوان ناتوانن گڕی توڕەیی ئەو خێڵانەی کوژرانی شێخ سەعید زۆر بەتوندی هەژاندوونی دامرکێننەوە. ئەگەر حکومەت وەڵامی ئەم داواکاریەش نەداتەوە ئەوا ئەوان دەستەوەستان دەوەستن لە بەرامبەر هێرش بردنی خێڵەکان بۆ سەر هەندێک لە شارەکانی ویلایەتی موسڵ و بڵاوکردنەوەی نیگەرانی و شڵەژاندنی بارودۆخەکە.

لە ئاست ئەم هەڕەشەیە والیی موسڵ بەناچاری شێخ مەحمودو ئەوانەی لەگەڵیدا بوون، لەگەڵ مەفرەزەیێکی سەربازی بۆ کەرکوک رەوانەکرد بۆ هێورکردنەوەی بارودۆخەکە.

بەڵام هەر کە شێخ مەحمود گەیشتە کەرکوک خێڵەکان لە دژی دانیشتوانی شاری سلێمانی، ئەوانەی هۆکاری دوورخستنەوەی خوالێخۆشبوو شێخ سەعید بوون بۆ موسڵ، هەڵسان. لەبەر ئەمە حکومەتی موسڵ فەرمانی بەموتەسەریفی سلێمانی دا کە دەبێت شارەکە بەجێبهێڵێت و بڕواتە بەغدا، بەڵام خێڵە سەرهەڵداوەکان لە رێگادا کەل وپەلەکەیان تاڵان کردو ناچار کرا بگەڕێتەوە بۆ سلێمانی. شارەکە هەر بەترس و شڵەژاوی مایەوە تاکو هاتنی «رەشید پاشا»ی والیی نوێی موسڵ بەڕەسەنایەتی، کە تەنها یەک رۆژ لە موسڵ گیرسایەوەو پاشان یەکسەر هاتە کەرکوک. لەوێشەوە شێخ مەحمودی لەگەڵ خۆی برد بۆ سلێمانی، ئینجا بارودۆخەکەی تیادا هێوربووەوە.

بەڵام دوای گەڕانەوەی ڕەشید پاشا بۆ موسڵ بارودۆخ لە سلێمانی گەڕایەوە سەر دۆخی جاران لە نیگەرانی و شڵەژان، ئەوەش وای لە هەندێک لە دانیشتوانەکەی کرد بەجێی بهێڵن و ڕوو لە بەغدا بکەن.

**ڕێوشوێنی ڕەشید پاشای والیی موسڵ**

هەر کە خوالێخۆشبوو ڕەشید پاشای والیی موسڵ لە سلێمانی گەڕایەوە یەکسەر دەستی کرد بەگرتنەبەری ڕێوشوێنی پێویست بۆ لێکۆڵینەوە لە کێشەی ڕووداوەکانی جەژن. ژمارەیەکی زۆری هاوڵاتییانی گرت، لەنێویان: خوالێخۆشبوو ڕەشید ئەفەندی ئەلعومەری و خوالێخۆشبوو شێخ ئیبراهیم ئەفەندی ئەلرۆمی و عەلی ئەفەندیی پێشنوێژ و مستەفا ئەلشەریفەو مەحمود ئەلعەزاوی -ناسراو بە«ئەبی جانگیر»-و یەحیا بن ئەیوب ئەلحاویس و نینۆسی دەلال (نینش الدلال)و براکەی شەمسی و زۆری تر. دوای وەرگرتنی ئیفادەی تۆمەتبارەکان و گوێگرتن لە بینەری سەلماندن (شهود الإثبات) لە گشت چینەکان، حکومەت زۆرێک لە ڕاگیراوەکانی ئازاد کرد، لەنێوَیان: ڕەشید ئەفەندی ئەلعومەری و شێخ ئیبراهیم ئەفەندی ئەلرۆمی و عەلی ئەفەندیی پێشنوێژ، (١٣٠) سەدو سی پیاو و (١٣) سێزدە ئافرەتیش لەنێو گرتووخاندا مانەوە. ئینجا حکومەتی ئەستەمبۆڵ چەند بەقسەهێنەر (مستنطق)ێکی لە دیاربەکرەوە بۆ موسڵ ڕەوانەکردن بۆ جێبەجێ کردنی دادگاییکردنی ڕاگیراوەکان. دادگاییکردنەکەش نزیکەی ساڵ و نیوێک بەردەوام بوو و بڕیاردرا (٥٠) پەنجا کەسیان بۆ ماوەی (٣) سێ ساڵ بەند بکرێن و، (١٣) سێزدە کەسیشیان لەسێدارە بدرێن، لەنێویان: ئەبو جانگیر (مەحمود ئەلعەزاوی)و یەحیا بن ئەیوب ئەلحاویس و نینۆسی دەلال، بەڵام کاتێک بڕیارەکانی ئەم فەرمانە نێردرانە ئەستەمبۆڵ بۆ پەسەندکردنی، بەرەتکردنەوەو بێ تاوانی هەموو گیراوەکان بۆیان گەڕایەوە. لەبەر ئەمە هەموویان ئازادکران جگە لە «ئەبی جانگیر» کە بەهۆی کێشەی ترەوە بۆ چەند ساڵێک لە گرتووخانەدا هێڵدرایەوە.

ئەوەی پێویستە ئاماژەی بۆ بکرێت ئەوەیە کە یەحیا بن ئەیوب ئەلحاویس لە گرتووخانەدا نەخۆش کەوت و سەری کول بوو و پێش گەیشتنی بڕیاری رەتکردنەوەو بەردانی گیراوەکان لە ئەستانە [ئەستەمبۆڵ] مرد. هەروەها شیاوی ئاماژەیە کە نینۆسی دەلال لە رۆژانی داگیرکاریەتی ئینگلیزەکاندا چووبووە بەغدا و کاری پاسەوانیەتی شەوی پێ ئەنجام دەدرا، لە گەڕەکی ئەلسابونچییە (الصابونجیة) کوژراو بکوژەکەشی ئاشکرا نەبوو.

**ئاریشەکە رامانی گەڕەکە!!**

ئەوەی پێویستی بەئاوڕلێدانەوە هەیە ئەوەیە کە سەپاندنی بەزۆرمانەوە (فرض الإقامة الجبرية) لەسەر خوالێخۆشبوو شێخ سەعید لە موسڵ و بەرپابوونی رووداوی شەهیدبوونی[١] لە سەردەمێک بوو، کە قسەی یەکلاکەرەوە بەدەست ئیتیحادیەکان بوو، -مەبەست لە ئیتیحادیەکان پیاوانی کومەڵەی (ئیتیحادو تەرەقی)ی بەناوبانگی نێو دەوڵەتی عوسمانییە. دادگایی کردنی تۆمەتبارانی ئەو رووداوە بەهەموو توندییەکانییەوە دوای لاچوونی ئیتیحادیەکان لەسەر دەسەلات و وەرگرتنی جلەوەکەی لە لایەن پیاوانی کۆمەڵەی (حورییەت و ئیتیلاف)ەوە بەرێوەچوو، بەڵام رەتکردنەوەی بڕیاری لەسێدارەدان و بەندکردنی هەندێک لە تۆمەتبارەکان و فەرمانی بەردانیان، لە سەردەمی گەڕانەوەی ئیتیحادیەکان بۆ سەر دەسەلات -بۆ جاری دووەم- بوو. زانراویشە لە بارەی ئیتیحادیەکانەوە کە نەدەسلەمینەوە لە ئەنجامدانی کاری توندوتیژی و خوێنرێژی لە رووبەڕووبوونەوەیاندا لەگەڵ نەیارانی سیاسەت و بیروباوەڕەکانیان. بەدڵنیاییەوەش دەیڵێین؛ روودانی ئەم ئاژاوەیە لە

(١) ئەم رووداوە لەنێو خەڵکی موسڵدا بەناوی (دقة شیخ سعید) بەناوبانگە، مێژووی بەسەرهات و لەدایکبوون ومردن وگەشت ومانەوەو هەرچی کاروبارێکی لەم چەشنەیە بەهۆی مێژووی ئەم رووداوەوە دەژمێرن. بگرە تاکو ئێستاش لەسەر زاری زۆرێک لەوانەی لەو رۆژگارە ژیاون و ئەو رۆژانەیان بینیوەو لە ژیاندا ماون دەبیسترێت.

سەردەمی ئەوانداو هەوڵدانی بەرپرسانی نێو حکومەتەکەیان بۆ بەفیڕۆدانی مافی هاوڵاتییان و هەڵوێست نەنواندنیان لە کاتی بەرپابوونی رووداوەکە، ئینجا بەردانی گیراوەکان ئەوانەی بۆ لێکۆڵینەوە دەستبەسەر کرابوون لە سەردەمی ئیتیلافیەکان -کە رکابەریان بوون-و خستنە ژێر پەردەی ئەو رووداوە خوێناویە، پەیوەندیەکی توندوتۆڵی بەکەللەڕەقی (رعونة) ئەو چینە ئیتیحادیەوە هەیە، کە مێژوو بەهەوەسکاری و کەللەڕەقی ناسیویەتی! سەرەنجام، دەتوانین وردەکاریەکانی ئاژاوەکەو ئەنجامەکانی لەم چەند خاڵەی خوارەوەدا پوخت کەینەوە:

١- هەڵچوونی ئەو کۆمەڵە حەشامەتەی لە باب ئەلتۆپ بوون، بەپاڵنەری ئەو غیرەیەی کە خەڵکی ئەوسای موسڵ پێی دەناسران. ئەمەش لەبەر تووش هاتنی ئەو ئافرەتەی پێشتر باسمان لێوە کرد.

٢- داواکردنیان بۆ تۆڵەسەندنەوەی کوژراوەکانیان، ئەوانەی لە کاتی پێکدادانیان لەگەڵ جەندرمەکان کوژرابوون(١).

٣- قۆزتنەوەی ئەم رووداوە بەگوێرەی بەرژەوەندییان، لە لایەن هەندێک کەسی بەبنەچە سلێمانی ئەوانەی لە موسڵ نیشتەجێبوون و چاویان بەو دەستڕۆیشتووە زۆرەی خانەوادەی شێخ سەعید هەڵنەدەهات.

٤- دوو دڵی دەسەڵاتداریەتی بەڕێوەبردن و سەربازی لە بارەی چارسەرکردنی کێشەکەو ئەو بێ هەڵوێستیەی لە بەرامبەر رووداوەکەدا نواندییان.

٥- ئەو هەڵەی بریکاری والی فەریق زەکی پاشا ئەلحەلەبی سەبارەت بەهێنانی خوالێخۆشبوو شێخ سەعید لەو خانووەی ژیانی تیایدا بەسەردەبرد بۆ بارەگاکەی، لە کاتێکدا هەڵچوون لەوپەڕیدابوو و

---

(١) ئەمین زەکی بەگ، کە لە ساڵی (١٩٢٤) بەڕێوەبەری پەروەردەی موسڵ بوو، یەکێک بوو لە ئەفسەرانی جەندرمەکانی موسڵ لە کاتی بەرپابوونی رووداوەکەی شێخ سەعید بەپلەی مولازمی یەکەم، خەڵکی سلێمانیشە، بەڵام نەمانزانیوە ناوی لەنێو ئەو رووداوانەدا هاتبێت، یان پشتگیری لایەنێک لە لایەنەکانی کردبێت.

خانووەکەشی بەتەواوەتی لەلایەن هەندێک کۆمەڵانی خەڵکی موسڵ گەمارۆدرابوو.

٦- داخستنی دەرگای بارەگاکە بەفەرمانی (تەوفیق بەگ دارەکە بێنە) لە کاتی لێ نزیک بوونەوەی خوالێخۆشبوو شێخ سەعیدو نەتوانینی چوونە ژوورەوەی.

٧- دەستی هەندێک لە پیاوانی کۆمەڵەی ئیتیحادو تەرەقی لە موسڵ کە رۆڵێکی چەپەڵیان لەنێو ئەم رووداوانەدا گێڕا، بۆ ئەوەی بۆ پیاوە دەسەڵات بەدەستانی ئیتیحادیەکان بسەلمێنن کە دڵسۆزن و دژی هەر کەسێکی (حەمیدی)ن -واتە هەموو ئەوانەی هاوسۆز بوون لەگەڵ خودا لێ رازی سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەمی عوسمانی، کە ئیتیحادیەکان لەسەر تەختی سەڵتەنەت لایان بردبوو-.

هاوشێوەی ئەم جۆرە کەسانەش زۆرن و لە هەموو سات و شوێنێکدا هەن، کە ناسڵەمێن لە خۆگونجاندن بەگوێرەی بارودۆخ و خۆ رەنگکردن بەهەموو رەنگێک و، مەرایی کردن بۆ خاوەن دەسەڵات و دەستڕۆیشتوان بەمەبەستی بەدەستهێنانی دەستکەوتێک یان بەپلەوپایە گەیشتن. لە پێناو گەیشتن بەمەرامەکانیشیان بەشوورەیی نازانن ئەم رەوشتە کەم و سووکە پەیڕەو بکەن و بەشێوازی هەمەجۆر لەبەریان بپارێنەوە. لە ئەنجامدانی تاوان و زیان گەیاندن بەخەڵکیش نە ویژدان رێیان لێ دەگرێت، نە ئایینیش بەرپەرچیان دەداتەوە.

## وتاری دووەم:

### شێخ عەبدولسەلامی دووەم کوڕی شێخ محەمەدی بارزانی

**شوێنی نیشتەجێبوونی بارزانییەکان:**

بارزانیەکان نیشتەجێی بەشی باشووری ناوچە شاخاویە سەختەکانی زێبارن، کە دەکەوێتە باکووری عیراق. ئەم ناوچەیە ناوەکەی لە (زێ) وەرگرتوە، واتاکەشی بەزمانی کوردی (رووبار) دەگەیەنێ. ئەم رووبارەش (زێی گەورە)یە کە لەنێو خاکی تورکیا هەڵدەقوڵێ و لە رۆژئاواو باشوورەوە دەوری ناوچەکەی داوە. جیا لە بارزانیەکان خێڵی تری ناودار بەهێزی خۆڕاگری لەم ناوچەیەدا نیشتەجێن، گرنگترینیان؛ شێروانی و مزوری و هەرکی، زێباری کە ئاغاکانی ئێستای زێبار سەرۆکایەتی دەکەن.

**واتای بارزان**

مامۆستا مەعروف چیاووک لە لاپەڕەی (٥٢)ی پەرتووکەکەی ([مأساة] بارزان المظلومة)دا دەڵێت پێموایە [ئەم ناوە] لە ناوی خێڵی (برازی[*])ەوە هاتووە، یان ناوی باپیرە گەورەکەیانە، واتاکەشی (ماف

---

(*) [خێڵی (برازی) یەکێکە لە خێڵەکانی دەڤەری بۆتان لە کوردستانی تورکیا- ورگێڕ]

هەڵگر) یان (مــــاف زان)، یان لە (بارســــان)ەوە هاتووە، واتە (دەروێشەکان)، یان (برازان[1]) واتە (إخوان الصفا[*]). بەهەرحاڵ (بارزان) ناوی خێڵێکی گەورەیە لە باکووری عیراق. من لەو باوەڕەدام کە بەبنەچە دەگەڕێنەوە سەر خێڵەکانی (هەکاری)ی رەسەن پاک و خانەدان، بەسەر چەند بنەماڵەو تیرەو خێڵ و هۆزێک دابەش دەبن، گرنگترینیان؛ شێروانی، مزوری، هەرکی، بەرۆژی واتە (رۆژوگرەکان[**])، کە بەخانەوادەی شێخەکان و گشت خزمەکانیان دەگوترێت، شێخەکانی ئێستاش نەوەی شێخ (تاجەدین نەقشبەندیی خالدی)ن، بنەماڵەکەشیان لە دەڤەری زێبارو بادینان بەناوبانگە[2].

### شێخ تاجەدین و نەوەکانی

«شێخ تاجەدین» دیارترین و بەرچاوترین شێخەکانی بارزان بوو، ئەوانەی لە ناوچەی زێبار بەدیارکەوتن. کە نەمانتوانی سەردەمەکەی دیاری بکەین. ناوبراو زانایەکی رێزدارو پایەبەرز بوو. نەوەکانیشی «شێخ عەبدولسەلامی یەکەم» و هەردوو براکەی «عەبدولڕەحمان»و

---

(١) (برازان) بەگوێرەی وەرگێڕانی مانا واتە (برای لێزان/برای زانا).

(*) [(إخوان الصفاء) ناوی رێبازێکی ئایینییە- وەرگێڕ]

(**) [ئەگەرچی ئەم ناوە بە(بەرۆژی) لەفز دەکرێت و لە کاتی وەرگێڕانی بۆ سەر زمانی عەرەبی دبێتە (الصائم) واتە (رۆژوگر)، بەڵام ناوەکە خۆی لە ئەسڵدا (بەر رۆژ)ەو لە زمانی عەرەبیشدا دەبێتە (مقابل الشمس) یان (مواجهة الشمس) واتە (بەرامبەر خۆر/ رووبەڕووی رۆژ). بۆ زیاتر سەلماندنی ئەم رایەش؛ لە لای باشووری رۆژئاوای ناوچەی (بەرۆژ) ناوچەیەک هەیە بەناوی (نزار) واتە (بەر سێبەر)، خەڵکەکەشی بە(نزاری) ناودەبرێن، ئەوانیش تیرەیەکی بارزانین- وەرگێڕ]

(٢) دەڵێم: لە لایەن بارزانییەکانەوە زانراوە کە شێخ تاجەدین لە سەر رێبازی نەقشبەندی نەبووە، بەڵکو یەکێک لە نەوەکانی، کە ئەویش شێخ عەبدولسەلامی یەکەمە، ئەم رێبازەی لە شێخ خالدی نەقشبەندی وەرگرتووە.

«عـەبدولڕەحـیم»ن(*). شـێخ عـەبدولسـەلام[ی یەکـەم] بوو ڕێبـازی نەقـشـبـەندیی لە شـێخ خـالدی نەقـشـبـەندی(١) وەرگـرت، کـاتێـک لە دەوروبەری نـیـوەی سـەدەی دوازدەهەمی کـۆچی، لەوکـاتەی لە یەکـێـک لە گەشتەکانیدا بە(بارزان)دا تێپەڕی بوو. مەزار (زاریة)ێکیشی لە بارزان دامەزراندو دەسـتی کرد بەوانەگـوتنەوەو ئامـۆژگـاری کـردن و ڕێنیـشـاندان، زانستخوازانیش لە هەموو لایەکەوە ڕوویان تێ کرد.

کـوڕێکی لەدوا بەجـێمـا بەناوی «شـێخ مـحـەمـەد» دوای ئەو بەم ئەرکـە هەڵسـاو هەوڵێکی زۆریدا بۆ بەهێـزکـردنی ڕێبـازی نەقـشـبـەندی و مکوم کردنی ستوونەکانی. کە کۆچی دواییشی کرد، پێنج کوڕی لەدوا بەجێمان، ئەوانیش ئەمـانەن؛ شـێخ عـەبدولسـەلامی دووەم، شـێخ ئەحـمـەد، شـێخ محەمەد سدیق و مەلا مستەفای بەناوبانگ و شێخ مـحەمـەد -کە بەناوی باوکـییەوە ناونرابوو، بەناوی (بابۆ) بانگ دەکرا-، هەمووشـیـان لە ژیاندا مـاون تەنهـا شـێخ عـەبدولسـەلام نەبێت دلۆڤـانیی خـودای لەسـەر بێت، گشتیشیان کوڕو نەوەیان هەیە.

---

(*)[ئەم زاتانە کوڕی شێخ تاجەدین بوون، نەک نەوەی- ورگێر]

(١) شێخ خـالدی نەقـشـبـەندی [١٧٧٦-١٨٢٨]، نازناوەکـەشی (ضیـاء الدین)ە، گەورەترین و بەرچاوترین زاناو ڕێنیشـاندەر بووە، و لە تیرەی (میـکائیلی)ی سەر بەخێڵی (جاف)ە. هەندێک لە سەرچاوەکانیش دەڵێن: ناوی تیرەی (مـیکائیلی) دەگـەڕێتـەوە بۆ (مـیـکائیل)ی باپیـریان، ڕەچەڵەکـەشـیـان دەگـەڕێننەوە سـەر ئەمـەوییـەکـان (الأمـویین)، شـێخ خـالدی ناوبراویش [دەڵێن] لە نەوەی خەلیـفـە عوسمانی کوڕی عەفانە خودای لێ ڕازی بێت. شێخ خالد گەشتێکی بۆ هیندستان کـردبوو و ڕێبـازی نەقـشـبـەندیشی لە شـێخ عـەبدوڵلای دەهلەویی نەقـشـبـەندی وەرگرتبوو. کاتێک گەڕایەوە وڵاتەکەی ئەم ڕێبـازەی لە سلێمانی بڵاوکردەوە، ئینجا ڕووی لە بەغدا کردو تەکیـەیەکی لە سەردەمی والی داود پاشا کردەوە، کە بەناوی (التکیـة الخـالدیة) دەناسـرا. چەندەها گـەشـتـیـشی بۆ باکووری عـیراق کـرد بۆ بڵاوکردنەوەی ڕێبازەکەی. هەروەها سەردانیماڵی پیرۆز (الدیار المقدسة)ی کرد، دوای ئەوەش لە شام گیرسایەوەو هەر لەوێش کۆچی دوایی کرد.

کوڕەکانی شێخ عەبدولسەلامی دووەم ئەم شێخانەن؛ سلێمان، ئیبراهیم، ئیسماعیل.
کوڕەکانی شێخ ئەحمەد ئەم شێخانەن؛ محەمەد خالّد، جەمال، عوسمان، نەزیر.
کوڕەکانی شێخ محەمەد سدیق ئەم شێخانەن؛ عەبدوڵلا، عەلی، نوری.
کوڕەکانی مەلا مستەفا ئەم شێخانەن؛ عوبەیدوڵلا، لوقمان، ئیدریس، سابر، مەسعود.
کوڕەکانی شێخ محەمەد (بابۆ) ئەم شێخانەن؛ سادق، شەفیع، ئەیوب.
هەروەها زانیومانە کە هەردوو براکەی تری شێخ عەبدولسەلامی یەکەم - مەبەستم عەبدولڕەحمان و عەبدولڕەحیم کوڕو نەوەیان هەیە، لەنێویان «یوسف کوڕی سەعید کوڕی عەبدولڕەحیم»مان ناسی.

**هۆکارەکانی ڕق هەڵسانی تورکە عوسمانییەکان لە شێخانی بارزانییەکان**

لەوەتەی دامەزراندن و گەشەسەندنی بزاڤی سۆفیگەری بارزانییەکان سەریهەڵداوە، نەزانراوە یاخیبوونێکیان لە دژی دەوڵەتی تورکیای عوسمانی ئەنجام دابێت، بەڵکو خەریکی خواپەرستی و بڵاوکردنەوەی ڕێبازی نەقشبەندی و بەهێزکردنی بوون. هەردەم دڵسۆزیی خۆشیان بۆ دەوڵەت دەنواند، ئەرکی باجدانیشیان بەدڵفراوانییەوە بەجێ دەگەیاندو دەیاندایە خەزێنەی ویلایەتی موسڵ، وەکو سۆفیگەرەکان، ئەوانەی بەئایینەوە خەریکن و واز لە دونیایەتی دەهێنن.

بەڵام ئاغاکانی زێبار، کە بەشێوەیەکی دەرەبەگایەتی حوکمی زێبارییەکانیان دەکرد، دڵتەنگ بوون لە بەرفراوانبوونی دەسەڵاتی شێخەکانی بارزان و چوونەڕیزی زۆرێک لە خێڵەکان بۆ ژێر ئاڵایانەوەو گرتنەبەری ڕێبازە نەقشبەندییەکەیان، بۆیە بەرەنگاریان بوونەوەو کاریان کرد بۆ دانانی رادەیەک بۆ ئەم دەستڕۆیشتووەیان. وای لێهات بارودۆخی نێوانیان ئاڵۆزبوو، تا گەیشتە ئەوەی لە سەردەمی شێخ عەبدولسەلامی یەکەم و کوڕەکەی شێخ محەمەد زنجیرە شەڕێکیان لەنێواندا ڕوویدا، کە لە

ئاکامدا بارزانیەکان سەرکەوتن بەسەر رکابەرەکانیان و تێکیانشکاندن لە لای چەپی زێی گەورەوە بۆ لای راستی زێیەکە، ئەم رووبارە بووە هێڵی جیاکەرەوەی نێوان ئەوان و بارزانیەکان.

لەگەڵ ئەوەشدا ئاغاکانی زێبار ئەوانەی تووشی تێکشکان هاتن، دەستەوەستان نەوەستان لە بەرامبەر رکابەرەکانیان، بەڵکو پەیوەندییان بەکاربەدەستانی حکومەتەوە کردو خۆیان لێ نزیک کردنەوە بۆ تووشکردنی بارزانیەکان بەهەڵبەستنی قسەی ناهەق لە بارەیانەوە، هیچ هۆو ئامرازێکیشان فەرامۆش نەکرد بۆ قۆزتنەوە لە دژیان. ئەم درۆو دەلەسانەش لە لایەن ئەو کاربەدەستانەی کە شارەزاییان لە بەڕێوەبردندا کەم بوو و بیرتەسک بوون پەسەند دەکران، تاکە کاریان تەنها بەرزکردنەوەی راپۆرت بوو لە دژی بارزانیەکان بۆ دەسەڵاتە بەرزەکان، تیایدا بەیاخی و نیاز خراپ تۆمەتباریان دەکردن.

داخوازیەکانی شێخ عەبدولسەلامی کوڕی شێخ محەمەد کە بۆ دەوڵەت بەرزی کردبوونەوەو تیایدا داوای هەندێک چاکسازی کردبوو بۆ ناوچەکەی لە لایەنی بەڕێوەبردن و دەرهێنانی لە کولبی هەژاری و دواکەوتوویی زانستی و داتەپیوی ئابووری(*) بوونە پشتگیر بۆ ئەو تۆمەتانەی خرابوونە پاڵی وەکو یاخی بوون و نیاز خراپی. حکومەتیش ئەم داخوازیانەی بەوە لە قەڵەمدا کە لە لایەن کۆمەڵە کوردیەکانەوە هاندراوە، ئەو کۆمەڵانەی تێدەکۆشان بۆ هێنانەکایەی دەسەڵاتێکی نامەرکەزی بۆ وڵاتی کوردان، هەروەکو چۆن ئازادیخوازەکانی عەرەبیش بۆی تیدەکۆشان.

بەڵکو لەمەشیان زیاتر پێوەلکاندو ئەوەیان خستەپاڵ کە دەستی لەگەڵ رووسەکان تێکەڵاو کردووە بۆ جێبەجێکردنی ئەم ئامانجەو جیابوونە لە دەوڵەت، لە کاتێکدا شێخ عەبدولسەلام لەوە گەورەتر بوو پشت

---

(*) [بۆ زانینی داخوازیەکان بڕوانە پەرتووکی (مەسعود بارزانی: بارزانی و بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد ١٩٣١-١٩٣٢، چاپخانەی خەبات، کوردستان ١٩٩٢، ل )- وەرگێڕ]

بەدەوڵەتیکی نامـوسـڵـمـان ببـەسـتـێت وملی بۆ کـەچ بکات و گـوێڕایەڵی بکات و بەپارێزەری موسـڵـمانانـی دابنێت، لە کاتێکدا دەوڵەت [دەوڵەتی عوسمانی] سومبولێکی پیرۆزیانە.

ئەگـەر پەناشی بردبێـتـەبەر خـاکی رووسـیـا دوای ئەوەی بۆ یەکـەم جـار لەشکرە تورکـیـیـەکـان هێـرشـیـان کـردەسـەر، و ئەگـەر رووسـەکـان ئەم هەڵوێستەی حکومەتیان لە بەرامبەر شێخ قۆزتبێتەوەو پێیان وابوو بێت کە لە کـاتی بەرپابوونی جـەنگی یەکـەمی جـیـهـانی ناچاری دەکـات ئەو خـسـتـنەڕوو (عـروض)ە زۆرانەی کــە زۆرجـار بۆیان دەخـسـتـنەڕوو بۆ پارێزگاری کردن لە خۆ قەبوڵ بکات، هەروەک «مس بیل» باسی کردووە لە لاپەڕەی (١١٥)ی پەرتووکی (تاریخ العـراق القـریب) کـە مـامـۆسـتـا جـەعـفـەر خـەیات وەریگێـڕاوەتە سـەر زمـانی عـەرەبی، ئەمـە شـێخ عـەبدولسـەلام ناخاتە خـانەی تۆمـەتباری مادەم ئاوڕی لەو خـسـتنەڕووانە نەداوەتەوەو ئارەزووی بۆ نەچووە، ئەوەش بەبەڵگەی دڵنەوابوونی دوای ئەوەی حکومەت فەرمانی لێخۆشبوونی دەرکرد، بەبێدەنگی و ئاسوودەیی گـەڕایەوە جـێگای خـۆی و هیچ شـتـێکی وای لێ بەدی نەکـرا کـە ئەو خستنەڕوانەی پەسندکردبن.

بەڵام هەرکە لەنێو خێڵەکانیدا حەسایەوە، حکومەت رووبەڕووی بووەوەو سـووربوو لەسـەر تۆمـارکـردنی گـوندە بارزانیـەکـان و سـەرژمـێـریکردن و ژمـاردنی مـەڕومـاڵاتەکـانیـان، بەهۆی ئەمـەوە بارزانیـەکـان گـیـانی شـۆڕشگێـڕییـان وروژاو پێـیـان وابوو ئەم هەنگاوەی حکومـەت وەک سەرەتایەکی رێخۆشکەرە بۆ سەپاندنی سەربازگیریی بەزۆرەملێ (التجنید الإجـبـاري)، هەروەها بۆ دانانی باجی زیاتر لەوەی باوە. بۆیە شـێخ عەبدولسەلام نارەزایی خۆی دەربڕی و تکای لە حکومەت کرد کە رەفتاری لەگەڵ بارزانیەکاندا -کە لە خێڵە نارزگارکراوەکانن[*]- با وەکو خێڵەکانی

---

(*) [(خێڵە نارزگارکراوەکان) واتە ئەو خێڵانەی رۆڵەکانیان خزمەتی سەربازییان نەدەکرد- وەرگێڕ]

دیکەی وەک خۆی بێت. بەڵام حکومەت هیچ بایەخێکی بەم داوایەی نەدا، بەڵکو سووربوو لەسەر جێبەجێ کردنی ئەم نیازەی بەهەر نرخێک بێت. گرفتێکی تریش روویدا بارودۆخەکەی ئاڵۆزتر کرد، ئەویش کێشەی پەنابردنی سەفوەت بەگی قایمقامی سەربازی بوو بۆ بارزان، کە بەتۆمەتی کوشتنی مەحمود شەوکەت پاشای سەرۆک وەزیران تۆمەتبار کرابوو. هەروەها رازی نەبوونی شێخ عەبدولسەلام بەبەدەستەوەدانی ناوبراو بەحکومەت. حکومەتیش ئەوکات بەخوێن وگۆشت ئیتیحادی بوو، پێویست بوو لەسەر پیاوانی دەسەڵات بەدەست پلانێکی راست و دروست پیادە بکەن لە چارەسەرکردنی کێشەی بارزانیەکان و ویستەکانیان لەبەرچاو بگرن و بەحیکمەت و ژیرانە سیاسەتیان بکەن. بەڵام ئەو جیاوازیە توندوتیژانەی کە لەنێوان پیاوانی حزبی (حورییەت و ئیتیلاف)و پیاوانی حزبی (ئیتیحادو تەرەقی) لەئارادا بوو، بارزانیەکانی تووشی سەرسوورمان کردبوو. جارێک خۆیان لە بەرامبەر حکومەتێکی دادپەروەردا دەدۆزییەوە کە بەهەڵسوکەوتێکی نەرم و دیدێکی شایستە مامەڵەی لەگەڵ دەکردن و خۆشویستنی سەقامگیری و دڵنیایی لە دڵ و دەروونیاندا دەچاند، هەروەکو چۆن لە مامەڵەی ئیتیلافیەکاندا بەدیار دەکەوێت، کە بنەمایەکی شێوەی ئاراستەکردنی سیاسەتە گشتییەکانیان بوو لەنێو هەموو گۆشەیەکی خاکی ئیمپراتۆرییەتەکەدا. جارێکیش خۆیان لە بەرامبەر حکومەتێک دەدییەوە کە جگە لە سیاسەتی کوشتن و برین بەهیچ شتێک رازی نەدەبوو، هەروەکو چۆن بڕیاربەدەستە (ئیتیحادیەکان) پێی بەناوبانگ بوون، کە بریتی بوو لەو هەڵسوکەوتە جۆشدراوانەی بەتوندوتیژی لە بەرامبەر [نەتەوەی غەیرە تورک]، جا چ عەرەب بن یان کورد یان هەر کۆمەڵێکی باوەڕ نەهێنێت بەبیروباوەڕەکانیان و سیاسەتەکانیانی قەبوڵ نەبێت و، ئەو سیاسەتەی کە دەوڵەتی عوسمانییان پێ بەڕێوەدەبرد پەسەند نەبێت، هەروەکو چۆن لە خوارەوە روونمان کردۆتەوە.

لە ئەستەمبوڵ کۆمەڵەیەک بەناوی (ئیتیحادو تەرەقی) دامەزرابوو، ئامانجیشی نەهێشتنی چەوساندنەوەو زۆرداری و هەوڵدان بوو لە پێناو بەرزڕاگرتنی پایەی دەوڵەتی عوسمانی و چاککردنەوەی باری وڵات و پێشخستنی بۆ ئەوەی بچێتە ریزی نەتەوە پێشکەوتووەکان. دوای تێکۆشانێکی درێژخایەن ئەم کۆمەڵەیە توانی وا لە سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم بکات دەستووری ساڵی (١٩٠٨) رابگەیەنێت، ئینجا زۆری پێ نەچوو لەسەر تەختی سەڵتەنەتیشیان هێنایەخوارەوەو براکەی «سوڵتان محەمەد رەشادی پێنجەم»یان لە شوێنی ئەو دانا.

کاتێک دەسەڵاتیشیان گرتەدەست پلانێکی وێرانکەریان لە سیاسەتەکانیاندا گرتەبەر کە رووی راستەقینەیانی ئاشکرا کرد، لە بەتورککردنی ئەو گەلانەی لە ژێر ئاڵای دەوڵەتی عوسمانیدا بوون و تواندنەوەیان لەنێو بۆتەی رەگەزی تورکداو، لە رادەبەدەر رەگەزپەرستییان نواند.

کاتێک هەندێک لە بیرمەندو هۆشمەندی دڵسۆز ئەم کارە هەڵەشانەیان بینی کە پێچەوانەی بنەما بنچینەکانی کۆمەڵەکە بوون، پارتێکی تری نوێیان لە ئەستەمبوڵ دامەرزاندو ناویاننا حزبی (حوربیەت و ئیتیلاف)، وەکو کۆمەڵەی (ئیتیحادو تەرەقی)یش لە گەورە شارەکانی دەوڵەتی عوسمانی لقیان بۆ کردنەوە. ئینجا دوای هاتنەریزی هەندێک لە گەورە پیاوان گەشەی کردو بەهێزکەوت، دەستی بەململانێ کرد لەگەڵ کومەڵەی ئیتیحادو تەرەقی و سەرکۆنەی دەکرد، هەروەها تێدەکۆشا بۆ لێخستنی پیاوەکانی ئیتیحادی لەسەر کورسیی دەسەڵات. ئەوەی ویستی بۆی هاتەدیێ و، پیاوەکانی شوێنی پیاوانی (ئیتیحادو تەرەقی)یان گرتەوەو خۆیان دوورخستەوە لە نانەوەی باری گرژی لەنێوان گەلانی نێو مەملەکەت و، بەژیری و لێزانییەوە کاریان دەکرد بۆ هێنانەکایەی تەبایی لە شوێنی لێک دوورکەوتنەوەو کۆکبوون لە شوێنی لێکدابڕان لەنێوانیاندا.

شێخ عەبدولسەلام کوڕی شێخ محەمەد لەنێو گەورەپیاوە پڕ چەکەکانیدا

بەڵام ئەو ئیتیحادیانەی دەیانویست خۆیان خاوەنی جڵەوی دەسەڵات بن لەسەر کاروباری دەوڵەت بەبێ هاوتا، دەستەوەستان نەوەستان لە بەرامبەر ئەو وەزارەتەی حزبی ئیتیلاف پێکیهێنابوو، کە خۆی دوور دەخستەوە لەو هەڵانەی ئیتیحادیەکان کردبوویان. بەڵکو لە هەوڵ و تەقەڵا دابوون بۆ دووبارە دەسەڵات گرتنەوەدەست. بۆ ئەم مەبەستەش پەنایان دەبردەبەر تیرۆرکاری و زۆرداری و، «نازم پاشا»ی وەزیری جەنگیان کوشت و توانییان وەزارەتی ئیتیلافیەکان لە کار بخەن و بۆ جاری دووەم بێنەوە سەر دەسەڵات، وەزارەتەکەشیان بەسەرۆکایەتی خوالێخۆشبوو مەحمود شەوکەت پاشای بەغدادی پێک هێناو جەمال پاشای خوێنڕێژیشیان کردە فەرماندەری سەربازی لە ئەستانە [ئەستەمبۆڵ]، ئەم پایەشیان بۆ دروست کرد بۆ ئەوەی هەرچیی پێی باش بێت بۆ پاراستنی ئاسایش و بەرەنگاربوونەوەی رکابەرەکانیان ئەنجامی بدات.

کوژرانی مەحمود شەوکەت پاشای سەرۆک وەزیرانیش چاکترین هەلی بۆ رەخساندن بۆ لەبەینبردنی پیاوانی پارتی حورییەت و ئیتیلاف و تەفروتوناکردنی گشت ئەوانەی بەربەرەکانێیان دەکردن و دوورخستنەوەی هەر یەکێکی لەگەڵ سیاسەتە چەوتەکانیاندا نەبوایە، خەڵکێکی زۆریشیان

لەسێدارەدا، بەندو دەربەدەرکردن و راگواستنەوەش بەردەوام بوو. نەک تەنها ئەمە، بەڵکو دەستیان کرد بەلەناوبردنی زۆرێک لە سەرۆک و شێخ و رابەرەکان لە گشت سووچێکی مەملەکەتەکەدا، بەتایبەتی ئەوانەی ئیتیلافیەکان بەژیری و وریاییەوە مامەڵەی لەگەڵدا دەکردن. یەکێک لەو شێخانەش خوالێخۆشبوو شێخ عەبدولسەلامی بارزانی بوو.

**شێخ عەبدولسەلام قوربانیی جیاوازییە رەقەکانی حزبی و سیاسی**

کاتێک بۆ یەکەم جار پیاوانی ئیتیحاد و تەرەقی جڵەوی دەسەڵاتیان گرتەدەست، دوای لێخستنی سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم، بەچاوی یاخیبوو لە دەوڵەت تەماشای شێخ عەبدولسەلامی کوڕی شێخ محەمەدیان کرد. هەموو ئەو سکاڵاو پڕوپاگەندەو راپۆرتە هەڵبەستراوانەی کە کارمەندان لەسەریان نووسیبوو بەراست و دروست لە قەڵەمدان پێش ئەوەی لێیان بکۆڵنەوەو بارودۆخەکانیان لەبەرچاو بگرن، بۆیە خوالێخۆشبوو محەمەد فازڵ پاشای داغستانی لە رۆژانی والییەتی خۆی لە موسڵ هێزێکی گەورەی لە لەشکری پڕچەککراو بەتۆپ هەڵیکوتایە سەر لایەنگرەکانی شێخ و چووە نێو گوندەکەی (بارزان)و تەکیەکەشیان خاپوور کردو ناچار کرا لە ناوچەکەی دەرچێ.

دواتر کە وەزارەتی ئیتیحادیەکان روخاو پیاوانی حزبی (حورییەت و ئیتیلاف) دەسەڵاتیان گرتەدەست خوالێخۆشبوو نازم پاشا کرابووە والیی بەغدا، ئەوەش پێش ئەوەی داوای بکەن بۆ ئەستەمبوڵ بۆ پێ سپاردنی وەزارەتی جەنگی لە لایەن پارتی ناوبراوەوە -کە خۆیشی یەکێک بوو لە کۆڵەگەکانی، ئەم والییە لێزانە دیتی کە بەرژەوەندی وا دەخوازێت پەردە لەسەر هەموو ئەو شتانەی درابوونە پاڵ شێخە بارزانیەکەو ئەو تۆمەتانەی خرابوونە ئەستۆی لابدرێت، بۆیە فەرمانی لێبوردنی بۆ ئەو و هەموو بارزانیە دەربەدەرەکان دەرکرد، بەڵکو لەمەش زیاتر کرا، کاتێک «ئەسعەد پاشای درووزی» والیی موسڵ بەوەکالەت داوای لە ئەنجومەنی وەزیران (باب العالي) کرد کە مەدالیایەک بەشێخ عەبدولسەلام ببەخشرێت.

باوەڕپێکراوە زیندووەکانی بارزانییش لە کاتی پەیوەندی پێوەکردنم، هەروەها چەند کەسێکی تریش لەوانەی کە زۆر لە شێخ عەبدولسەلامەوە نزیک بوون و هەر لە سەرەتاوە ئەو ڕووداوانەیان بینیوەو لەنێویاندا ژیاون، بۆیان گێڕامەوە کە لە سەردەمی والییەتی نازم پاشا لە بەغدا، «سەفوەت بەگ»ی قایمقامی سەربازی پەیوەندی بەخوالێخۆشبوو شێخ عەبدولسەلامەوە کرد بەمەبەستی لێکۆڵینەوە لە کێشەکانی بارزانیەکان و دۆزینەوەی چارەسەری عادیلانە بۆیان. وا پێدەچێت سەفوەت بەگ زۆر سەرکەوتوو بووبێت لەم کارەیداو، بڕواشی هێناوە بەنیازپاکی شێخ و موریدەکانی، لەوانەشە پەیوەندی هەبێت لەنێوان ئەم سەرکەوتنەی و داواکردنی بەخشینی ئەو مەدالیایەی پێشتر باسمان لێوەکرد لە لایەن ئەسعەد پاشای والیی موسڵ بەوەکالەت.

بەڵام بارودۆخەکە لەسەر ئەم ڕێچکەیە درێژەی نەکێشا، چونکە نازم پاشای وەزیری جەنگ لە ئەستەمبۆڵ کوژراو، دووبارە پیاوانی کۆمەڵەی ئیتیحادو تەرەقی گەڕانەوە سەر دەسەڵات و بەدەستێکی ئاسنین وڵاتیان بەڕێوەدەبردو، دەستیان کردەوە بەسیاسەتی توندوتیژی و لێدانی ڕکابەرەکانیان و جێبەجێ کردنی مەبەستەکانیان جا بەهەر شێوەیەک بوایە.

یەکێک لە کۆڵەگەکانی حزبەکەشیان بەناوی سلێمان نەزیف پاشای کوڕی سەعید بەگی مێژوونووسی بەناوبانگ کردە والیی موسڵ[1] و وەزارتەکەیان دەسەڵاتێکی ڕەهای پێ بەخشی. هەرچەندە ئەم کابرایە

(١) لەنێو پاشکۆی ژمارەی (١٤)ی پەرتووکی (منية الأدباء في تاريخ الموصل الحدباء)دا -کە مامۆستا سەعید ئەلدیوەچی بەئەرکی ئامادەکردن و بڵاوکردنەوەی هەڵسابوو، لیستێکی بەناوی ئەو والی و ڕێپێدراوانەی تێدایە، ئەوانەی فەرمانڕەوایەتی مووسڵیان گرتۆتە ئەستۆ لە ساڵی (١٠٠٠)ی کۆچییەوە تاکو سەردەمی ئێستامان [مەبەست لە ئێستا ساڵی بڵاوکردنەوەی ئەم بابەتەیە لە ڕۆژنامەی (صدى الأحرار)دا لە ساڵی (١٩٥١)، یاخود ساڵی بەپەرتووک کردنیەتی لە (١٩٥٥)- و.]، ئەویش لە خاوەنی پەرتووکی (منية الأدباء)و =

(کورد)ەو خەڵکی دیاریەکرە، بەڵام یەکێک بوو لە توندڕەوانی نەتەوەی تورک، وە لەبەر ڕۆشنایی ئەو سیاسەتەی کە لە لایەن حزبەکەیەوە دارێژرابوو، ئەرکی بەگژداچوونەوەی شێخ عەبدولسەلامی بارزانی، کە ئەوکات گەڕابووەوە (بارزان) دوای ئەوەی لەسەردەمی ئیتیلافیەکان فەرمانی لێبوردنی بۆ دەرچووبوو، وەکو پێشتر باسمان کرد، کردە جێگای بایەخی خۆی و ڕووداوەکانی پێشووی بارزان و پەنابردنی سەفوەت بەگی قایمقامی سەربازی -کە بەکوشتنی مەحمود شەوکەت پاشا تاوانبار کرابوو- بۆ بارزان کردە بەهانەیەک بۆ کردنەوەی دەرگای شەڕفرۆشتن بەشێخ عەبدولسەلام و لەناوبردنی.

**چیرۆکی پەنابردنی سەفوەت بەگ بۆ لای شێخ عەبدولسەلام**

لە سەردەمی فەرمانڕەوایەتی ئیتیلافیەکان لە جەنگی یەکەمی بەڵقانی ساڵی (١٩١٢) لەشکرەکانی عوسمانی دووچاری شکست هاتن. ئیتیحادیەکانیش ئەمەیان بۆ بەرژەوەندی خۆیان قۆزتەوە، هەڵسان خۆپیشاندانێکیان لە بەرامبەر ئەنجومەنی وەزیران سازکرد وەک نارەزایی دەربڕینێک لە دژیان، کاتێک نازم پاشای وەزیری جەنگ بەپێر خۆپیشاندەرەکانەوە هات و قسەی بۆ کردن، ویستی هێوریان بکاتەوە، ئەنوەر پاشا، کە یەکێک بوو لە کۆڵەگەکانی کۆمەڵەی ئیتیحادو تەرەقی، گوللەیەکی ئاراستە کردو کوشتی، بەکوژرانی ئەویش ئیتیحادیەکان توانییان وەزارەتی ئیتیلافیەکان بڕوخێنن و خۆیان بۆ جاری دووەم

---

=(سالنامة ولاية الموصل)ی ساڵی (١٣٣٠) وەرگرتبوو، هەروەها ئەو زانیاریانەی دکتۆر سدیق ئەلجەلیلی بۆی ناردبوون، تیایدا دکتۆر ئەلجەلیلی گوتبووی سەردەمی والییەتی سلێمان نەزیف لە موسڵ لە ساڵی (١٣٣١) بووە، دوای ئەویش باسی ماوەی والییەتی دکتۆر رەشید بەگی کردووەو دەڵێت لە ساڵی (١٣٣١) تاکو (١٣٣٣) بووە. ئەمەش لەگەڵ واقیعدا ناکۆکە، بەڵکو ئەوەی ڕاستی بێت ماوەی والییەتی رەشید بەگ لە پێش ماوەی والییەتی سلێمان نەزیف بووە، کە لە ساڵی (١٣٣١) کۆچی دەستپێدەکات تاکو (١٣٣٣).

کاروباری دەسەڵاتیان گرتەوەدەست و سەرۆکایەتی وەزارەتیشیان بەخوالێخۆشبوو مەحمود شەوکەت پاشا سپارد.

لە ماوەی ئەم رووداوانەشدا سەفوەت بەگی قایمقامی سەربازی، کە یەکێک بوو لە پیاوانی حزبی حوریبەت و ئیتیلاف، لە موسڵ بوو، بەڵام لەناکاو لە موسڵ بزربوو. دوای ماوەیەک مەحمود شەوکەت پاشا لە ئەستەمبوڵ لە شەقامی (دیوان یۆڵی) کوژرا. ئامادەباشیەکی مەحکەم بۆ کوشتنی کرابوو، کە بەم شێوەیە بوو؛ (کۆمەڵە خەڵکێک رێورەسمی تەرمێکی ساختەیان نواندو بەرەو لای ئۆتۆمبێلەکەی مەحمود شەوکەت پاشا برد، شوفێری ئۆتۆمبێلەکەش رایگرت تاکو حەشامەتەکە تێپەرێت، لەوکاتەدا گوللەیەک لە مەحمود شەوکەت پاشا دراو کوژرا، گوللەیەکیش لە یەکێک لە یاوەرەکانی درا، کاتێک هەوڵیدا تەقەیان لێ بکاتەوە ئەویش کوژرا. هەر لەو کاتەوە کەس لەنێو شەقامەکەدا نەما تەنها کفنە بەتاڵەکە نەبێت لەگەڵ هەردوو تەرمی کوژراوەکەو یاوەرەکەی، کە لەنێو ئۆتۆمبێلە نابراوەکەدا کەوتبوون).

ئیتیحادیەکانیش ئەم تاوانەیان خستەپاڵ رکابەرەکانیان لە حزبی حوریبەت و ئیتیلاف. پروپاگەندەی ئەوەش بڵاوبووەوە کە بکوژەکە سەفوەت بەگی ئاماژە بۆکراوە، پەناشی بردۆتە بەر شێخ عەبدولسەلام.

ئەوەی راستی بێت، وابوو سەفوەت بەگ پەنای بردبووە بەر شێخ عەبدولسەلام، ئەوەش بەهۆی ئەو یەکترناسین و دۆستایەتیە پێشوەختەی نێوانیان هەروەکو پێشتر باسمان کرد. بەو پێیەی کە قایمقامی ناوبراو یەکێک بوو لە پیاوانی ئیتیلافیەکان ئەوانەی سۆزداربوون لەگەڵ شێخ عەبدولسەلام بەهۆی پێگە ئاینیەکەیەوە، هەروەها چونکە بەپێچەوانەی بۆچوونی ئیتیحادیەکان پێیان وابوو لایەنگیری حکومەتەو لە ملکەچی دەرنەچووە.

سەفوەت بەگ لەلایەن شێخ عەبدولسەلامەوە رێزی لێگیرا، قوتابخانەیەکیشی لە ماوەی بوونی لە (بارزان) کردەوەو هەر خۆیشی وانەکانی دەگوتەوە.

**سلێمان نەزیف داوا لە شێخ عەبدولسەلام دەكات سەفوەت بەگ بەدەستەوە بدات**

والی سلێمان نەزیف

والی سلێمان نەزیف پاشا داوای لە شێخ عەبدولسەلام كرد سەفوەت بەگ بەدەست حكومەتەوە بدات، یان خۆی لە موسڵ ئامادە بێت، ئەگەرچی دڵنیاشبوو لەوەی كە شێخ عەبدولسەلام نە سەفوەت بەگ بەدەستەوە دەدات نە بەخۆیشی لە موسڵ ئامادە دەبێت.

باشە چۆن جوامێری و پیاوەتیی شێخ عەبدولسەلام و دینداریەكەی رێی پێدەدات پەناهێنەرو میوانێكی خۆی بەدەستەوە بدات، یان عورفی عەشایەری و نەریتە پەیڕەوكراوەكان لە لایەن خێڵەكان بەكوشتدانی پەناهەندە بەچی لێكدەدرێتەوە، ئینجا ئایا رەوایە شێخی بارزان لەوپەڕی خێراییدا بێتە موسڵ لە كاتێكدا شارەزای هەڵسوكەوتی خەڵك و بێ ئەمەكیانەو دەزانێت چ خراپەیەكیان لە دڵدایە بەرامبەر ئەو!

واتە هەر ئەوەندەی لەسەرە داواكەی والی رەت بكاتەوەو خۆی لە چیاكان مەڵاس بدات و چاوەڕێی قەدەر بكات.

لەبەر ئەمە، والی سلێمان نەزیف پاشا لەشكرێكی بەهێزی ناردە سەر شێخ عەبدولسەلام، خێڵەكانیش لە هەموو لایەكەوە بەهانایەوە هاتن.

هێزەكانی حكومەت شەڕێكی دژواریان لەگەڵ بارزانیەكان بەرپا كرد، لە ئاكامدا نەیانتوانی خۆیان لە بەرامبەریان رابگرن و شوێنەكانیان جێهیشت و بەخێزانەكانیانەوە بۆ ئێران كۆچیان كرد.

لەشكری حكومەت و ئەو خێڵانەی لەگەڵیدابوون گوندە بارزانیەكانیان تێك وپێكدان و، هەرچی دەستیان پێ گەیشت تاڵانیان كردو گوندی شێخیشیان وێران كردو تەكیە ئایینیەكەشیان خاپوور كرد.

دوای گەیشتنی بارزانیەکان بۆ نێو خاکی ئێران، بەسەر گوندەکانی دەوروبەری ناوچەی (ورمێ)دا دابەش و نیشتەجێ بوون، وەرزیش بەهاربوو.

شێخ عەبدولسەلامیش بووە میوانی ماڵی سەید تەهای شێخ [محەمەد] سدیق شەمزینی لە گوندی (نەهری[*])، کە نزیکەی سێ قۆناغ لە (ورمێ)یەوە دوورە، بۆ ماوەی پێنج مانگ بەم میوانیەتیە مایەوە. رۆژێک لە رۆژان لەگەڵ نزیکەی (١٠) دە لە پیاوەکانی قەستی گوندی (جاریا)ی کرد، کە «سمکۆ»ی لێ دەژیاو لە نزیک سنووری تورکیا-ئێران هەڵکەوتووە، بووە میوانی ماڵی ناوبراو -سمکۆ[١]-، لەو ماوە کەمەی لەوێ مایەوە زۆر رێزو حورمەتی گیرا.

---

(*)[گوندی (راژان)بوو، نەک (نەهری). بڕوانە پەرتووکی (مەسعود بارزانی: بارزانی و بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد ١٩٣١-١٩٣٢، چاپخانەی خەبات، کوردستان ١٩٩٢، ل ٢٠)- وەرگێڕ]

(١) ئیسماعیل ئاغای ناسراو بە(سمکۆ) سەرۆکی خێڵی شکاکی کوردە لە ناوچە ئێرانیەکە [ناوچە کوردنشینەکەی ژێر دەسەڵاتی ئێران-و]، دوای کۆتاییهاتنی جەنگی یەکەمی جیهانی ناوبانگێکی زۆری دەستخست و، دەسەڵاتەکەشی فراوانتر بوو. بەسەرهاتی ترسناکیشی لەگەڵ تەیارییە (نەستوری)یەکاندا هەیە، سەرۆکە ئاینییەکەیانی -کە بە«مار شەمعون» ناودەبرا- لەگەڵ کۆمەڵێک لە پیاوەکانی لە گۆندی (کۆنە شار)ی نزیک (ورمێ) کوشت، لەو کاتەی چووبووە گوندە ئامادەبۆکراوەکە بۆ چاوپێکەوتنی سمکۆ و رێککەوتن لەگەڵی بەمەبەستی پێکەوەنانی حکومەتێکی کوردی-تەیاری هاوبەش. وە کاتێک تەیارییەکان جەنگەکانیان لە دژی نیشتەجێکراوە کوردەکان لەنێو خاکی تورکیا دەستپێکردو هێرش دوای هێرشیان دەکردنە سەر، جارێکیان لە کارمەندو سەربازە تورکەکانیشیاندا لە ناوچەی (جۆلەمێرگ)، بۆیە تورکەکان هێزێکی گەورەیان بەسەرکردایەتی «عەلی ئیحسان پاشا» بۆ سازکردن، ئەویش بەسەریانی داداو ناچاری کردن بەخۆو خێزانەکانیانەوە بەرەو ئێران کۆچ بکەن، لەوێش سمکۆ رێی لێ گرتن شوێن دوای شوێن راوی دەنان، لە (كلي حسن قلة) [لەوانەیە (سیان=

ئیسماعیل ئاغا (سمکۆ) لەگەڵ کۆمەڵێک لە پیاوە دلێرەکانی

= کلە) بێت، کە سەد میل لە باشووری ورمێیەوە دوورە. یانیش (قەڵای شاهین) بێت. بۆ پتر زانیاری لەم بارەیەوە بڕوانە پەرتووکی (دبلیو.أی. ویگرام - إدگار تی. أی. ویگرام: مهد البشرية/ الحياة في شرق كردستان، ترجمة: جرجيس فتح الله، دار ئاراس للطباعة والنشر، ط ٣، أربيل ٢٠٠١، ص ٣١٤)، هەروەها پەرتووکی (بانی پاڵ رامسینی: تراژیدیای ئاشوورییەکان، وەرگێڕانی: فریاد بارزانی، کتێبی گوڵان (6)، چ ١، هەولێر ١٩٩٧، ل ١٥و ١٦)- وەرگێڕ]، کە ڕێگای هەمەدانی پێدا ڕەت دەبێت، تووشیان هات و زۆریانی لەناوبرد، تاکو ئەو ئینگلیزانەی لە ئێران بوون بەهانایانەوە هاتن و کۆمەڵە پەرتەوازەکانیان بۆ هەمەدان گواستنەوە، لەوێشەوە بۆ (بەعقوبە) هێنران. «سمکۆ»ش لەوە بەدواوە بووە سەرچاوەی نیگەرانی بۆ دەسەڵاتداریەتی ئێران، بۆیە لەبەر ڕۆشنایی بەرفراوانبوونی دەسەڵاتەکەی لەو دەڤەرانە، حکومەتی خوالێخۆشبوو ڕەزا شای پەهلەوی لە ساڵی (١٩٣٦) داوای لێ کرد خۆی ئامادە بکات بۆ ئەوەی بکرێتە سەرۆکی خێڵە کوردیەکانی ناوچە باکوریەکەی ئێران، بەڵام هەر کە گەیشتە شارۆچکەی (شنۆ) ئێرانییەکان بەغەدەر کوشتیان [بەڵکو لە تەموزی ساڵی ١٩٣٠ کوشتیان- و]. ئەوکات لە دەوروبەری دەیەی چوارەمی تەمەنی دابوو، باڵای مامناوەندی بوو، جەستە بەهێزو ڕەنگ سپیی مەیلەوسوور بوو، هەروەها چاونەترس و ئازابوو.

له ڕێگای گەڕانەوەشیدا بۆ بارەگای پێشووی له گوندی (نەهری) ژمارەیەک له کوردەکان هاتنەسەر ڕێگاکەی و بەهەموو جۆرە پاڕانەوەیەک داوایان لێ کرد تەشریف بەرێتە گوندەکەیان، ئەویش داوای لێبوردنی لێ کردن. بەڵام ئەوان هەر سووربوون لەسەر داواکەیان و گوتیان گەورەی گوندەکەمان [گوندی (گەنگەچین)] کە ناوی دەروێش عەبدوڵڵایە سوێندی خواردووە کە ئەگەر ئەم سەردانە پەسەند نەکات خانووەکەی خۆی دەسووتێنێ. ئەم سەردانەی دەبێتە مایەی شانازی بۆ خۆی و خێڵەکەی کە زۆر بەپەرۆشن بۆ دیتنی ئەو و پیرۆزبوون بەدەست ماچ کردنی. ئەویش دلۆڤانیی خودای لەسەر بێت له بەرامبەر ئەم پێداگرتنەیان، کە بەرواڵەت نیازپاک و دڵسۆزانەبوو، داواکەیانی پەسەند کرد. له سنوور پەڕییەوەو چووە نێو خاکی تورکیاو، بووە میوانی دەروێش عەبدوڵڵا. ئەمەیش سەرۆکی تیرەیەکی خێڵی شکاکی نێو خاکی تورکیایە.

دەروێش عەبدوڵڵا بەخێرهاتنێکی گەرمی کردو بردییە ماڵی خۆی، دوای ئەوە ژمارەیەک له پیاوە چەکدارەکانی گوندەکە هاتن چواردەوری خانووەکەیان گرت، ئینجا دەروێش عەبدوڵڵا بەرەو رووی شێخ عەبدولسەلام هات و نیشانەکانی ناپاکی و دووڕوویی لەسەر دەم و چاوەکانیەوە بەدیارکەوتن و، پێی گوت: تۆ له یاسای ئەو حکومەتەی ئێمە ملکەچێتیی دەکەین دەرچووی، ئێستاش بۆت نییە تەنها ئەوە نەبێت کە خۆت بەئەمری واقیع بسپێری، ئێمەش دەتدەینە دەست حکومەت.

شێخ عەبدولسەلامیش بەهەموو شێوەیەک هەوڵی رازی کردنی دەروێش عەبدوڵڵایدا بۆ ئەوەی واز لەو بیرۆکە دەغەڵەی کە بەنیازی ئەنجامدانی بوو بهێنێت، بەڵام لەو کەللەڕەقییەی نەهاتەخوارەوەو گوێی نەدایە نەریتی خێڵەکایەتی کە سەرکۆنەی هەر زیان گەیاندنێک بەمیوان دەکەن، تەنانەت ئەگەر دوژمنترین کەسیشیان بێت. چ جای کەسێک کە بەو شێوەیەی باسمان لێوەکرد میوانیان کردبوو، له هەمان کاتدا نە رکابەری ئەوان بوو و نە دوژمنداریەکی پێشتریشیان له نێواندا هەبووە، زێدەباری ئەوەی کە

گەورەی هۆزێکەو پیاوێکی ئایین و زانستە، کە دەبوایە دوژمن لە پێش دۆستەکان بەزەیی پێ بهاتایەوە بەهۆی ئەو بەلایەی بەسەر خۆی و خێلەکەیدا هاتبوو، کەچی ئەم کابرایە دووڕووە فەرمانی دایە پیاوەکانی خۆی کە پاسەوانەکانی شێخ عەبدولسەلام چەک بکەن.

بەلام ئەم ئازایانە مکوڕبوون لەسەر خۆبەکوشتدان لە پێناو داکۆکی کردن لە شێخەکەیان کە بەدڵ و گیان لە گەڵیدان، شێخیش دلۆڤانیی خودای لەسەر بێت پێی وابوو بەرهەڵستی کردن جیا لە خوێن رشتن هیچی تری بەدواوە ناهێت، بۆیە نەیهێشت پیاوەکانی بەرەنگاری بکەن و خۆی بەخودا سپارد، بەلام دوو لە پیاوەکانی خۆیان پێ رانەگیراو هێرشیان کردەسەر ئەو پیاوانەی زەق تەماشایان دەکردن، چەند کەسێکیان لێ کوشتن و لە خانووەکە چوونەدەر، بەلام پیاوانی گوندەکە بەسەریاندا زاڵبوون و هەردووکیان کوشتن.

پاشان شێخ عەبدولسەلام و پیاوەکانی تریان بردنە نزیکترین بنکەی حکومی و بەدەستەوەیان دان. لەوێش بردرانە ویلایەتی (وان)و لەوێشەوە بۆ (دیاربەکر)، ئینجا هێزێکی تورکی هێنایانیە موسڵ[1].

---

(١) دەڵێم: لەمەڕا بەدیاردەکەوێت کە تورکەکان نەیانتوانیووە بەهۆی فارس ئاغای زێبارییەوە شێخی بارزان دەستگیر بکەن، وەک «مس بیل» لە لاپەڕەی (١١٥)ی پەرتووکی (تاريخ العراق القريب)دا باسی لێوەکردووە، بەڵکو توانییان بەهۆی ئەو فرتوفێڵە چەپەڵەی دەروێش عەبدوڵڵای ناوبراو پلانی بۆ داڕشتبوو دەستگیری بکەن.

### سلێمان نەزیف دەچێتەدەرەوە بۆ چاوپێکەوتنی شێخ عەبدولسەلام

کاتێ سلێمان نەزیف -والیی موسڵ- بەوادەی گەیشتنی شێخ عەبدولسەلام لە ڕێگای (باب سنجار)ەوە بۆ موسڵ زانی، سواری گالیسکەکەی بوو و بەرەو ئەو ڕێگایە بەڕێ کەوت، و لە شوێنێکی نزیک گۆڕی شێخ قوزەیب ئەلبان (مرقد الشيخ قضيب ألبان) گالیسکەکەی ڕاگرت و هاتەخوارەوەو لەسەر لێواری ڕێگاکە دانیشت. دوای بەسەرچوونی ساتێکی کەم شێخ عەبدولسەلام -کە بەسواری دەوارێک بوو- بەدیارکەوت، چوار دەوریشی بەسەرباز دەور درابوو. سلێمان نەزیف کە بینیی هەڵسا بۆ چاوپێکەوتنی، ئینجا ڕایگرت و پێی گوت: تۆی شێخ عەبدولسەلامی بارزانی؟. ئەویش وەڵامی دایەوە: بەڵێ.

ئینجا سلێمان نەزیف گوتی: بۆچی سەرپێچیت لە فەرمانەکانی حکومەت کردو نەهاتیە موسڵ و بەم شێوەیە هاتی. شێخیش پێی گوت: هەڵەم کرد!.

دوای ئەوە سلێمان نەزیف سواری گالیسکەکەی بووەوەو گەڕایەوە بۆ سەرای حکومەت [لە موسڵ]، سەربازەکانیش بەدوایەوە ڕۆیشتن تاکو گەیشتنە قوڵغە سەربازیەکە (الثكنة العسكرية)و شێخ و یاوەرەکانیشییان خستنەناویەوە.

### لەسێدارەدانی شێخ عەبدولسەلام لەگەڵ سێ لە یاوەرانی

سلێمان نەزیف پاشا ئەنجومەنێکی سەربازیی پێکهێنا بۆ دادگاییکردنێکی ڕووکەشیانەی شێخ عەبدولسەلام و شوێنکەوتووانی، بڕیاردرا ئەو [واتە شێخ عەبدولسەلام]و سێ لە یاوەرەکانی لەسێدارە بدرێن.

لە ئێوارەی ڕۆژی (١٥)ی موحەڕەمی حەرامی ساڵی (١٣٣٣)ی ڕێککەوتی (٢٠)ی تشرینی دووەمی ساڵی (١٣٣٠)ی ڕۆمی، کە ڕێککەوتە لەگەڵ (١)ی کانوونی یەکەمی ساڵی (١٩١٤)ی زایینی

فەرمان درایە هەندێک لە جەندرمەکان کە تەقە بکەن وەک ئاگادارییێک بۆ لەسێدارەدانی شێخ عەبدولسەلام لەو شەوەدا بەمەبەستی هاتنەدەرەوەی خەڵکی بۆ بینینی ئەو دیمەنە جەرگبڕو دڵتەزێنە (المشهد الفضیع).

پێش داهاتنی نیوەشەو شێخ عەبدولسەلام و هەرسێ بەندکراوەکەیتریان هێنایە گۆڕپانی لەسێدارەدان، لە نێوان قولغەی سەربازی و قولغەی پاشایەتی، کە چوار قەنارەی لێ ئامادە کرابوون. ئەوسا شێخ عەبدولسەلام دەستنوێژی خۆی شوشت و قورئانی خوێندەوەو دوو رکات نوێژی کرد، دوای ئەوەش داوای لێبوردنی کردو، پەیمانیدا کە لەسەر سنووری رووسەکان سەنگەر بگرێت و نەهێڵێت بخزێنە نێو سنووری وڵاتی ئیسلام، هەروەها بڕە پارەیەکی زۆر و چەند سەد وڵاخێک دەداتە حکومەت. بەڵام کە گوێیان لە قسەکانی نەگرت و ئەو پەیمانانە سوودی بۆ نەبوو، بەرەو پەتی قەنارەکە رۆیشت و گوتی: مردنی من بەم شێوەیە لە بەرژەوەندی دەوڵەتدا نییە.

پاشان لەگەڵ هەرسێ یاوەرەکەی لەسێدارەدرا، ئەوانیش هەروەکو چۆن ناوەکانیانم لەنێو یاداشتەکانی خوالێخۆشبوو خالّم «محەمەد بەگی کوڕی سالّح بەگ ئالّ ئەمین بەگ»دا بینی و بەدەستخەتی خۆی نووسراوەو ئێستا لە لای کوڕەکەی «ئەلموقەدەم ئەلسەید ئەمین محەمەد» هەڵگیراوە، ئەمانەن:

١- «محەمەد ئاغا هێشەتی»، خەڵکی گوندی (هێشەت)ەو سەرۆکێکی خێڵی (رێکانی(*))بوو و لە تەمەنی پیریەتیدا بوو.

٢- «عەبدی ئاغای مزوری»، لە دەوروبەری چل ساڵیدا بوو.

٣- «عەلی کوڕی محەمەدەمین ئاغای مزوری»، خەڵکی گوندی (بابسێڤا)یەو گەنجێکی تازەپێگەیشتووبوو. هەر ئەویش بوو لە کاتی چوونە سەر کورسیی قەنارە وتە بەناوبانگەکەی گوت: «خۆلّی(**)

---

(*)[(رێکانی)و (نێروەیی) دوو خێڵی هاوسێی یەکترین، کەسی ناوبراویش سەر بەخێڵی نێروەیە، واتە (نێروەیی)ە نەک (رێکانی)- وەرگێڕ]

(**) [(خۆلّی) واتە (خۆڵەمێش)، بەشێوەزاری دەڤەری بارزان- وەرگێڕ]

*بسەرێ حوکمەتێ، بارزانی پ لقنارەدانا مە ڤەنابرییێن. بارزانی قەت نامرن».*

جیاوازیش لە گێڕانەوەکاندا هەبوون سەبارەت ناوی دووەم و سێیەمی ئەم لەسێدارەدراوانە، بۆیە پەیوەندیم بەچەند کەسێکی ئاگادارو شارەزای خودی بارزانیەکانەوە کرد، وەک دەڵێن (خاوەن ماڵ لە هەموو کەس باشتر شارەزای ماڵی خۆیەتی)، ئەوانیش تێکڕای ئەو ناوانەی ناوم هێنابوون بەراست و دروستیان لە قەڵەم دان.

شێخ عەبدولسەلام و هاوڕێیەکانیشی لە گۆڕستانەکەی بەرامبەر مزگەوتی (عومەر ئەلمووەللا) -کە ئێستا بەگۆڕستانی (ئەلبو بەدران) ناودەبرێت- نێژران.

بارزانیە دەستبەسەرکراوەکانی تریش خرابوونە نێو بەندیخانەوە، ژمارەیەکی زۆریشیان هەر لەنێو بەندیخانەکەدا کۆچی دواییان کرد، چەند کەسێکمان لێ ناسین، لەوانە خوالێخۆشبوو «نوری» کە خاڵی شێخ عەبدولسەلام بوو، هەروەها «محەمەدئەمین ئاغا بابسێڤی» باوکی خوالێخۆشبوو «عەلی»، کە یەکێک بوو لە لەسێدارەدراوەکان.

## سیماو روخساری شێخ عەبدولسەلام

شێخ عەبدولسەلام باڵابەرز و لەش باریک و ڕەنگ گەنمی و ڕووخۆش بوو. چاویلکەشی لە چاو دەکرد لەبەر هەبوونی شێوانێکی بچووک لەسەر چاوی ڕاستەی.

کەشیدەیەکی سپیی لەسەردەناو خەرقەیەکی ڕەشی لە وەرزە ساردەکاندا لەبەردەکرد، لە وەرزەکانی تریش یەکێکی سپی یان زەردی لەبەردەکرد، لەسەرەوەشی شان پۆشێکی لە خوری دروستکراوی لەبەردەکرد.

چاونەترس و ئازا و ڕووساڵار و دیندار و لەخواترس بوو. تەمەنیشی نزیکەی پەنجا(*) ساڵ دەبوو، دلۆڤانیی خودای لەسەر بێت.

---

(*) [هەوڵ و کۆششێکی زۆرم دا بۆ ئەوەی تەمەنی ڕاستەقینەی شێخ عەبدولسەلام بزانم، بەڵام لەم زانیاریانەی خوارەوە زیاترم دەست نەکەوت:

شێخ محەمەدی بارزانی لە ساڵی (١٩٠٢) کۆچی دوایی کرد، داواشی کردبوو شێخ عەبدولسەلامی کوڕی شوێنی بگرێتەوە، ئەوسا تەمەنی شێخ عەبدولسەلام لە (٢٨) ساڵ ڕەتی نەکردبوو، لە ساڵی (١٩١٤)ش شەهیدکرا. بەپێی ئەمە بەکۆکردنەوەی (٢٨) ساڵ لەگەڵ (١٢) ساڵی دوایی کۆچی باوکی دەبێت تەمەنی (٤٠) ساڵ بووبێت. بڕوانە پەرتووکی (پێ ڕەش: بارزان وحركة الوعي القومي الكردي ١٨٢٦-١٩١٤، دون مكان- ١٩٨٠، ص ٨٤ و ٨٨ و١٤٣).

هەروەها لە ژمارە (٩)ی گۆڤاری (سەنتەری برایەتی)دا د. عەبدولفەتاح عەلی یەحیا وتارێکی بەناونیشانی (شێخ عەبدولسەلامی بارزانی ١٨٧٤-١٩١٤) نووسیوە، ئەمەشیان پاڵپشتی ئەوە دەکات کە تەمەنی چل ساڵ بووبێت. بەڵام لە یەکێک لە چاوپێکەوتنەکانم دا لەگەڵ ڕێزدار ئەدهەم بارزانی پێیوابوو، خوالێخۆشبوو شێخ عەبدولسەلامی دووەم لە تەمەنی (٣٦) ساڵیدا شەهیدکراوە، نەک پەنجا ساڵی. سەرەنجام وەک دیارە ناکۆکییەک هەیە لەسەر تەمەنی ڕاستەقینەی شێخ عەبدولسەلامی دووەم- وەرگێڕ]

## وتاری سێیەم

### شێخ زاریی زەوبەعی

ناوی تەوای «زاری کوڕی زاهیر کوڕی مەحمود کوڕی زاهیر کوڕی حەمام کوڕی سلێمان»ەو سەرۆکی خێڵی (زەوبەع)ی نیشتەجێی نێوان بەغداو فەلوجەیە.

شێخ زاریی زەوبەعی

(زەوبەع)یش لیقێکە لە هۆزی تەیی قەحتانی (طيء القحطانية)، کە لەنێو سنووری زۆرێک لە وڵاتە عەرەبییەکاندا پەرت و بڵاوەو بەسەرهاتی مێژوویی بەناوبانگیان هەیە لە پێش و پاش ئیسلام. لاپەڕەیەکی پڕشنگداریشیان هەیە لە مێژووی پاڵەوانیەتی عەرەبایەتیداو، هەڵوێستی مەردانەشیان نواندووە لە هەردوو سەردەمی نەزانی (الجاهلية)و ئیسلامدا. توێژەرەوەو بەدواداچووەکانیش لەم بارەوە گەواهیان بۆ دەدەن. گەلێک پیاویان لەنێودا هەڵکەوتووە بەزانست و مەردایەتی و ئازایەتی و لێوەشاوەیی سەرکردایەتی کردنی جەنگەکان بەناوبانگ بوونە.

«شێخ زاری»یش دلۆڤانیی خودای لەسەر بێت کە لەم رەگە عەرەبە کۆنەو ئەم زنجیرە (سُلالة) رەسەنەیە، بەسەربەرزی و پیاوەتی و ئازایەتی و بەهاناداچوون و رەوشت بەرزی و زۆر سیمای تری رەسەنی عەرەبییەوە ناسراوبوو، ئەم خەسڵەتانەی خۆشەویستی کرد لە لای خێڵەکەی و سەرکردایەتی کردنی خۆیان پێ سپاردو خۆیان لە پێناویدا بەخت کرد.

شێخ زاری بەیەکێک لە کەڵەپیاوانی شۆڕشی عیراق دادەنرێ ئەوانەی

پشکدارییان کردبوو له سەربەخۆبوونی عیراق و دەرهێنانی له چنگ دەسەڵاتی داگیرکەری سەربازیی بەریتانی.

شۆڕشەکەشی دوای کوژرانی کۆلۆنێل «لیچمان»ی فەرماندارى سیاسیی ناوچەی (دلیم) له رۆژی (١٢)ی ئابی (١٩٢٠) له (خـان النقطة)ی نێوان بەغداو فەلوجه بەرپاکرد، که تیایدا هێزەکانی ئینگلیز زیانێکی زۆری ماڵی و گیانییان لێ کەوتەوە. شۆڕشەکەی شێخ زاری تاکو کۆتاییەکانی مانگی ئەیلوولی (١٩٢٠) بەردەوام بوو، واته نزیکەی مانگ و نیوێک، دەیتوانی بۆ ماوەیەکی درێژتریش بەردەوام بێت ئەگەر هەندێک لەو سەرۆک هۆزە گەورانەی که هاوکاری ئینگلیزەکانیان دەکرد له دژی نەوەستابوونایە. له نموونەی «عەلی ئەلسلیمان»ی سەرۆکی خێڵەکانی (دلیم)و، «فەهد ئەلهەزال»ی سەرۆکی خێڵەکانی (عنزه) له عێراق(*).

### کوژرانی کۆلۆنێل لیچمان

مامۆستا «شێخ محەمەد ئەلمەهدی ئەلبەسیر» له لاپەڕە (٢٥٠و ٢٥١)ی پەرتووکەکەیدا (تاريخ القضية العراقية) له بارەی چۆنیەتی کوژرانی کۆلۆنێل لیچمان و ئەو هۆیانەی بوونه مایەی ئەو کوشتنه له ژێر ناونیشانی (شۆڕشەکەی سەرووی فورات)، نووسیبووی:

(... عەرەبەکانی خێڵی زەوبەع چەند کردارێکی گەورەی شۆڕشگێڕییان لەو دەڤەرە ئەنجامداوە، نیشانەکانی خۆئامادەکردنی ئەم خێڵه بۆ هەڵسان بەشۆڕش له ناوەڕاستی (ذي القعدة)و سەرەتای (ئۆگستۆس)دا بەدیارکەوتن، بەڵام هیچ کارێکی وایان نەکرد که شایەنی باسکردن بێت، تاکو بەسەرچوونی (١٠) دە رۆژ، کاتێک «کۆلۆنێل لیچمان»ی فەرمانداری سیاسی ناوچەی لیوای دلێم داوای له سەرۆکی خێڵی زەوبەع

(*) [بۆ پتر ئاشنابوون بەو شۆڕشەو دەستخستنی زانیاری وردتر لەبارەیەوە بڕوانه پەرتووکی (عبدالرزاق الحسني: الثورة العراقية الكبرى، مطبعة دار الكتب، ط ٥، بيروت ١٩٨٢، ص ٢٢٧ الى ٢٣٣)- وەرگێڕ]

«شێخ زاری» کرد کە لە (خان النقطة) -کە دەکەوێتە نێوان بەغداو فەلوجە- ئامادەبێت بۆ چاوپێکەوتنی. «شێخ زاری»یش داواکەی فەرماندازی بەجێهێناو لە (٢٧)ی (ذي القعدة)ی رێککەوت لەگەڵ (١٢)ی ئۆگستۆس [لە شوێنە ئامـاژەبۆکراوەکە] ئامادەبوو، دوو کوڕو کۆمەڵە پیاوێکی خێڵەکەشی لەگەڵدابوون. بەڵام کۆلۆنێل لیچمان لەوێ نەبوو، بۆیە لەبەر دەرگای (خان)ەکە -کە هێزێکی پۆلیسی تێدابوو- دانیشتن. دوای بەسەرچوونی دوو کاتژمێر کۆلۆنێل لیچمان بەدیارکەوت، خزمەتکارو شوفێری ئۆتۆمبێلەکەشی لەگەڵدابوون، پێکەوە لەگەڵ شێخ زاری چووە نێو (خان)ەکەو دەستیان بەگفتوگۆ کرد دەربارەی کشتوکاڵ و بەروبومەکانی شێخ. لەوکاتەی ئەوان خەریکی ئەم قسانەیان بوون کۆمەڵە عەرەبێک هاتنە لایان گلەیی ئەوەیان کرد کە چەند چەتیەک لەسەر رێگادا هێرشیان کردوونەتەسەر و هەندێک کەل وپەلیان لێ دزیبوون. وەختێ کۆلۆنێل گوێبیستی هەواڵی ئەم رووداوەبوو، یەکسەر فەرمانی دایە ئەفسەری پۆلیسەکان کە خێرا بەدوای ئەو چەتانەدا بچێت و، فەرمانی پێکرد (١٠) دە لە پیاوانی پۆلیس و چەند پیاوێک لە خێڵی زەوبەع لەگەڵ خۆی ببات.

ئالێرەدا کۆلۆنێل لیچمان بەتوورەو توندی قسەی لەگەڵ شێخ زاری کردو هۆکاری شڵەژانی ئاسایشی خستەملی ئەوو هۆی رووداوانی رووداوە ئاماژبۆکراوەکەشی بۆ ئەوو هۆزەکەی گەڕاندەوە. دیارە ئەم وشانەی کۆلۆنێل لیچمان زۆر بریندارکەر بوون، لەبەر ئەوە شێخ زاری تووڕەبوو و روخسەتخوازیی لێکرد بۆ چوونەدەرەوە، ئەویش رێی دا، بەڵام دوای ماوەیەکی کورت گەڕایەوەو داوای لە پاسەوانەکە کرد کە رێی چوونە ژوورەوەیان بدات بۆ لای فەرماندار، ئەویش رێی پێ دان، چووە ژوورەکەیەوەو «خەمیس»ی کوڕی و پیاوێکی تری خانەوادەکەیشی لەگەڵدابوو، کە رووبەڕووی لیچمان بوونەوە «خەمیس» دەستپێشخەریی کردو بەچەند گوللەیەک دەستدرێژی لێکردو خستیەخوارەوە، بەڵام گیانی لەبەردا مابوو و تەماشای «شێخ زاری»ی کردو گوتی: (ناپاکیت تا ئەم

رادەیە). ئەوسا شێخ زاری شیرێکی لێداو گیانی لەبەر براند. هەواڵی کوژرانەکەی وەکو هەورەتریشقە بەرگوێی پیاوانی حکومەت کەوت، چونکە ئەم ئەفسەرە لە پیاوە هەرە گەورەکانی بەریتانی بوو، ئەوانەی شارەزای کاروباری ئەم وڵاتەن و زانیارییەکی بەرفراوانیان لە سەر نەریتەکانیەوە هەیە).

دەڵێم: رۆژنامەی (الموصل) لە ژمارەی دەرچووی لە (٢٣)ی ئابی ساڵی (١٩٢٠) ئەم هەواڵەی خوارەوەی دەربارەی کوژرانی لیچمان بڵاوکردبۆوە:

لیچمان کوژرا و شێخی (زەوبەع)یش هێلی ئاسنینی نێوان بەغداو فەلوجەی لە نزیک (خان النقطة)دا بڕیوەتەوە. رۆژنامەی (بەگداد تایمز)یش دەڵێت بکوژی لیچمان «خەمیس»ەو شوفێری ئۆتۆمبێلەکەشی لەگەڵدا کوشتووەو، تەرمەکەشی بردراوەتە فەلوجەو لە یەکێک لە بنکە سەربازیەکان نێژراوە. رۆژنامەی (العراق)یش لە ژمارەی بەرواری (٢٠)ی ئابی (١٩٢٠) رایگەیاندبوو کە تەمەنی کۆلۆنێل لیچمان چل ساڵ بوو.

**کۆلۆنێل لیچمان(*) کێیە!**

ناوی تەواوی «لفتنێنت کۆلۆنێل جیرار ئەی. لیچمان سی. ئای. ئی.»یەو لە (ئەلای سپکس)ی پاشایەتی بوو، -کە سەر بەبەڕێوەبەرایەتی پاشایەتی بەریتانیا لە عیراق بوو.

گرنگترین پیاوی ئینگلیزەکان بوو لەوانەی شارەزاییان لە کاروباری عەرەبیدا هەبوو.

لە ماوەی جەنگی یەکەمی جیهانیشدا، هاوڕێیەتی هەڵمەتی

---

(*) [ئەم کۆلۆنێلە پێشنیاری کردبوو خێڵە کوردەکانی سەر سنووری تورکیا لەسەر زێدو ماڵ و حاڵی خۆیان رابگوازرێن و نەستورییەکان لە شوێنی ئەوان نیشتەجێ بکرێن، ئەمەش نەک لەبەر ئەوەی کە مەسیحین، بەڵکو بەمەبەستی پەرش وبڵاوکردن و لەناوبردنی کوردەکان بوو. بڕوانە پەرتووکی (معروف چیاووك: مأساة بارزان المظلومة، دار ئاراس للطباعة والنشر، ط ٢، أربيل ٢٠٠١، ص ٥١و ٥٢) - وەرگێڕ]

کۆلۆنێل لیچمان

ئینگلیزەکانی کردبوو بۆ سەر موسڵ، کاتێک ئاگربەستیش راگەیاندرا لە (٣١)ی تشرینی یەکەمی ساڵی (١٩١٨) لەگەڵ هێزەکانی ئینگلیز لە (٣)ی تشرینی دووەمی هەمان ساڵ چووە نێو شاری موسڵ. وە دوای ئەوەی لەشکرە تورکییەکان لە رۆژی (٥) تشرینی دووەم لەگەڵ سەرکردەکەیان «عەلی ئیحسان پاشا» پاشەکشەیان لە موسڵ کرد، «نوری بەگ»ی جێگری والییش لە (١٣)ی تشرینی دووەم موسڵی بەجێهێشت، لەوساوە کۆلۆنێل لیچمان بووە فەرمانداری سیاسیی بێ هاوتای موسڵ. زۆر چوست و چالاک و بەجموجۆڵ بوو، چاونەترس و سەرکێش بوو، زۆر جاریش ژیانی خۆی تووشی تەنگانەو مەترسی دەکرد. لە وردەکاریەکانی کێشەی گەورەو بچووکیشی دەکۆڵییەوە، هەر بەخۆیشی سەرپەرشتی بەڕێوەچوونی هەر دەزگایەک لە دەزگاکانی حکومەتی دەکرد. سروشتێکی تیژی هەبوو، هەڵسوکەوتەکانیشی سەرشێتانە بوون، بەپێچەوانەی ئەوەی باوە لای بەریتانیەکان، کە بەخوێن ساردی و پشوودرێژی و قووڵ بیرکردنەوەو رکێفکردنی دەمارهەڵچوون و چەندەها خوو رەوشتی تر، کە سروشتێکی تایبەت بەگەلی بەریتانین و لە جیهاندا پێی دەناسرێن. بۆیە کۆتاییەکەی بەم شێوە ئاماژەبۆکراوە وەک ئەنجامێکی رەها، بۆ ئەو ئاکارو رەوشتانەی دەگەڕێتەوە کە پێیان ناسراوبوو، هەروەها ناکرێت ئەو هەڵسوکەوتە سەرشێتانەی لە لایەن شێخێکی عەرەبەوە، کە رابەرایەتی هۆزێکی گەورەی عەرەبی سەرفیرازو خاوەن نەریت دەکات تەحەمول بکرێن، کە لە ئێستاو کۆنەوە بەسەربەرزی و سەربەخۆیی خۆیانەوە دەنازن. بۆیە هەر دەبوایە کۆتاییەکەی بەم شێوەیە بێت. ئەم رووداوەش دەنگی دایەوەو بەهۆی دەشت و دۆڵەکانەوە لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تری وڵاتی بەرفراوانی عەرەبەکاندا بڵاوبۆوە.

رووداوی زۆر مەترسیدار رووبەرووی فەرمانداریەتی کۆڵۆنێل لیچمان بوونەوە لە موسڵ، پێشەنگی ئەو رووداوانەش؛ بزووتنەوەی نیشتمانی بوون، کە کۆمەڵەی (العَلَم)ی نهێنی لە موسڵ ئاگرەکەی هەڵگیرساندبوو، لە دوای ئەویش کۆمەڵەی (العهد) ئاستەنگ و گیروگرفتی بۆ نایەوەو رای گشتی لە دژی دەسەلاتداریەتی داگیرکەر وروژاندو زۆرێک لە هەوڵ و تەقەلاکانی داگیرکەرانی بۆ چەوساندنەوەی عیراق و داگیرکردنی پوچەڵ کردنەوە[١]. **وەک**؛ کوژرانی هەندێک لە فەرماندارە سیاسیەکانی هەندێک لە قەزاکانی موسڵ، یەکێکیان دوای ئەوی تریان. هەروەها ئەو شۆڕشە توندوتیژانەی کوردەکان لە ناوچە شاخاویەکانی موسڵ پێی هەڵسان.

هەر رووداوێکیش لەم رووداوانە، بەدەرهاویشتەکانیانەوە بەس بوون بۆ خەوزراندنی دەسەلاتی داگیرکەر. «کۆڵۆنێل لیچمان»یش خۆی لە بەرامبەر تەزوویەکی رامالی نیگەرانی دۆزییەوە، کە پێویستی بەهەوڵ و

(١) کۆمەڵەی (ئەلعەلەم) لە سەرەتاکانی سالی (١٩١٤) لە موسڵ دامەزرابوو، بەلام دوای پەیوەندیکردن و ئالوگۆڕکردنی بیروڕا لە نێوان ئەم کۆمەڵەیەو بارەگای گشتی کۆمەڵەی (ئەلعەهد ئەلعیراقی) لە دیمەشقی شام، لە (٢٤)ی ئاياری (١٩١٩) ناوەکەی گۆڕدرا بۆ (جەمعییەت ئەلعەهد ئەلعیراقی)، ئەمەش دوای لابردنی ئەو برگەیەی کە دەڵێت (بەسوودوەرگرتن لە یارمەتی بەریتانیا لە رووی هونەرییەوە بۆ عیراق) لەنێو پەیڕەوی کۆمەڵەی (ئەلعەهد ئەلعیراقی)دا.

مامۆستا محەمەد رەئووف ئەلغولامی [برای نووسەری ئەم پەرتووکە و خاوەنی رۆژنامەی (صدى الأحرار)بوو- و.] بەناونیشانی (مُرَخَّص) [واتە رێپێدراو] سەرۆکایەتی کۆمەڵەی (ئەلعەلەم)ی دەکرد، ناسناوەکەشی (نادب الحق)بوو، دواتر کاتێک ناوی کۆمەڵەکە گۆڕا بۆ (جەمعییەت ئەلعەهد ئەلعیراقی)و بووە لقێکی سەر بەبارەگای گشتی کە لە دیمەشق بوو، پلەکەی کرایە (مُعتمداً) [واتە پشت پێبەستراو] لە جیاتی (مُرَخَّص)، ناوە نهێنییەکەشی لە (نادب الحق)ەوە گۆڕدرا بۆ (المنصور).

کۆششێکی زیاترو بەردەوام هەبوو بۆ ئەنجامدانی کارێکی خێرای یەکلاکەرەوە. گومانی تێدا نییە کە [ئەو ڕووداوانە] نەخشەو پلانە سیاسی و بەڕێوەبەرایەتیەکانی «کۆلۆنێل لیچمان»یان شێواندبوون و زۆر ماندوویانی کردبوو. لەو شۆڕشانەی لە ڕۆژانی ئەودا بەرپاببوون؛

شۆڕشەکەی خێڵی (گۆیان) لە ناوچەی زاخۆ بەسەرۆکایەتی حوسام ئاغا (حەسۆ گۆیی)، کە دوابەدوای کوشتنی «کاپتن پیرسن» لە (٤)ی نیسانی (١٩١٩) بەرپاببوو، خێڵەکانی (سندی)یش بەشداربیان تێداکرد بەسەرۆکایەتی «جەمیل ئاغا»و «عەبدی ئاغا»، خێڵی (گولی)یش بەسەرۆکایەتی سادق ئیبراهیم (سادق برۆ)، هەروەها خێڵەکانی (قشوری)ی کۆچەر.

هەروەها لە (١٥)ی تەمموزی (١٩١٩) شۆڕشی ئامێدی بەکوشتنی فەرمانداری سیاسیی ئامێدی «کاپتن ویلی»و ئەفسەری پۆلیسەکان «ماکدۆناڵد»و عەریف «ترۆپ»و چەندانی تر هەڵگیرسا، کە حەجی شەعبان ئاغا -گەورەپیاوێکی ئامێدی بوو- پێی هەڵسابوو.

لە ڕۆژانی (٨)و (٩)ی مانگی ئابی (١٩١٩) پیاوانی شۆڕشی ئامێدی بەسەرکردایەتی «حەجی ڕەشید بەگ» لەگەڵ هێزە گەورەکەی داگیرکەران لە (گەلیێ مزورکا) تووشی یەکترهاتن و شەڕێکی گەرم و گوڕی لێ کەوتەوە، تیایدا شۆڕشگێڕەکان سەرکەوتن دوای ئەوەی لیوایەکی تەواویان لە هێزی داگیرکەران لەناوبرد.

هەفتەیەک بەسەر ئەم شەڕە بەناوبانگەدا نەچوو تاکو پێکدادانێکی تریش لە (سوارەتوکا) ڕوویدا. بەرچاوترین پیاوەکانی پێکدادانەکەش «سادق برۆ»و «سلێمان قەتی»و، «تاهر هەمزانی» لە خێڵی (ئەرتیس)ی دۆسکی بوون.

دوای ئەم پێکدادانەش شەڕی (نهالآ مەلا عەرەب)و (کەلا شابانیێ) لە دەوروبەری ناحیەی (گولی) لە قەزای زاخۆ ڕوویاندا، تیایدا شۆڕشگێڕان فرۆکەیەکی ئینگلیزیان خستەخوارەوە.

ئەمەو چەندەها شۆڕش و پێکدادانی تر، لەوانە: پێکدادانەکەی (بامەڕنێ) لە مانگی ئابی (١٩١٩)ی ڕێککەوتی (ذي القعدة)ی (١٣٣٧) بەسەرۆکایەتی خوالێخۆشبوو شێخ ڕەئووف نەقشبەندی. ئینگلیزەکان توانییان لەدواییدا دەست بەسەر (بامەڕنێ)دا بگرن و خوالێخۆشبوو شێخ بەهائەدین ئەفەندی و براکەی خوالێخۆشبوو عەلائەدین ئەفەندیی باوکی «شێخ ڕەئووف»ی ئاماژبۆکراو، لەگەڵ هەندێک لە خزم و شوێنکەوتوانی دەستبەسەرکران و هێنرانە موسڵ و خسترانە نێو بەندیخانەی ڕاگیران (سجن التوقیف)، پاشان شێخ بەهائەدین ئەفەندی لەگەڵ کۆمەڵێک لە خزم و پیاوەکانی بۆ بەغدا دوورخرایەوە.

ئەمە دەڵێم و مەبەستم ئەوە نییە ئەم لایەنە شۆڕشگێڕیە باس بکەم کە پێویستە لە شوێنێکی تردا بەتێروتەسەلی لێی بکۆڵدرێتەوە، بەڵکو بۆ ئەوە باسی ئەم ڕووداوانەم کرد تاکو بیرۆکەیەکی سەرپێیی لە بارەی ئەو ئاریشانەی کە ڕووبەڕووی کۆلۆنێل لیچمان دەبوونەوە بەدرێژایی ماوەی فەرمانڕەوایەتیی لە موسڵ -کە ساڵێکی تەواوی خایاند- لای خوێنەر دروست بکەم. دواتر لە ڕۆژی (١٢)ی تشرینی یەکەمی ساڵی (١٩١٩)ی ڕێککەوتی (١٧)ی موحەڕەمی (١٣٣٨) گواسترایەوە بۆ ناوچەی (دلێم)، بەشێوەیەکی ڕەسمی و بەئامادەبوونی کۆمەڵێک خەڵکی لایەنگیریان لە موسڵ بەڕێ کرا، هەر لە هەمان کاتیشدا پێشوازی لە جێگرەوەکەی «کۆلۆنێل بیل»ی فەرمانداری نوێی سیاسی کرا.

بەڵام ڕۆژانی ئەم فەرمانداره لە موسڵ لە (٢٣) بیست و سێ ڕۆژ زیاتری نەخایاند، چونکە لە (٤)ی تشرینی دووەمی ساڵی (١٩١٩) لە کاتی ئەنجامدانی گەشتێکی پشکنین ئامێزدا لە نزیک گوندی (بیراکەپرا)ی سەر بەقەزای (ئاکرێ[1]) شۆڕشگێڕە زێبارییەکان

---

(١) لەنێو پاشکۆی ژمارە (١٤)ی پەرتووکی (منیە الأدباء فی تاریخ الموصل الحدباء)دا بەم شێوەیە باس لە مێژووی فەرمانڕەوایەتی هەر یەکێک لە کۆلۆنێل لیچمان و کۆلۆنێل بیل کراوە: (کۆلۆنێل لیچمان-کاپتن بیل ١٩١٨-١٩٢٠).=

بەسەرۆکایەتی «فارس ئاغا»و «بابەکر ئاغا»و «مەحمود ئاغا» هێرشیان کردەسەر و کوشتیان، هەروەها «کاپتن سکۆت»ی فەرمانداری (ئاکرێ)شیان لەگەڵدا کوشت، ئەمەش دەستپێکی ئەو شۆڕشە بوو کە بارزانیەکان بەسەرۆکایەتی «شێخ ئەحمەد بارزانی» بەشدارییان تێدا کرد وەک هاوکارییێک بۆ رکابەرە کۆنەکانی لە پێناو ئامانجی هاوبەشیان، کە رزگاربوون بوو لە چەپۆکی دەسەڵاتی داگیرکەران.

هەمووشیان هێرشیان کردەسەر (ئاکرێ)و لە رۆژی (١٤)ی تشرینی دووەمی ساڵی (١٩١٩)ی رێککەوت لەگەڵ (٢٠)ی سەفەری ساڵی (١٣٣٨)دا دەستیان بەسەردا گرت و هەندێک لە پاسەوانەکانیان کوشتن و دەستیان بەسەر خەزنەی دارایی حکومەتی بەریتانی دا گرت(١).

---

= ئەوەی راستی بێت ماوەی فەرمانڕەوایەتی ئەم هەردوو فەرمانداره لە ساڵی (١٩١٩) تێنەپەڕیوە، چونکە فەرمانڕەوایەتی کۆلۆنێل لیچمان لە تشرینی دووەمی (١٩١٨)ەوە دەستپێدەکات تاکو (١٢)ی تشرینی یەکەمی ساڵی (١٩١٩)، فەرمانڕەوایەتی «مستەر بیل»یش لە (١٢)ی تشرینی یەکەم دەستپێدەکات و بەکوژرانی لە (٤)ی تشرینی دووەمی هەمان ساڵ کۆتایی دێت، هەروەک چۆن پێشتر روونمان کردۆتەوە.

(١) بەچاکی دەزانین زیاتر لە بارەی ئەم شۆڕشانە بدوێین: دوای کوژرانی «مستەر بیل»ی فەرمانداری موسڵ لە ناوچەی (ئاکرێ)، فەرمانداریکی سیاسی بۆ موسڵ دامەزرێندرا بەناوی «کۆلۆنێل نۆلدەر»، لە سەردەمی ئەویشدا چەند پێکدادانێک لە سەرەتای حەفتەی دووەمی مانگی تشرینی دووەمی ساڵی (١٩١٩) لە (دەشتی هەریرو باتاس)ی رۆژهەڵاتی ئاکرێ روویدا، کە خێڵەکانی سورچی بەسەرۆکایەتی شێخ رەقیب، هەروەها خێڵی [خێڵەکانی] سۆرانیش بەشدارییان تیایدا کردبوو. زیانەکانی هێزەکانی ئینگلیزیش لەم شۆڕشانەدا، جا چ ئەوانەی لە رۆژانی فەرمانڕەوایەتی کۆلۆنێل لیچمەن روویاندابوو، یاخود ئەوانەی لە سەردەمی فەرمانڕەوایەتی «مستەر بیل» و «کۆلۆنێل نۆلدەر» هەڵگیرسابوون لە (٢٠٠٠) دوو هەزار کوشتیار کەمتر نەبوو، جگە لە سەدەها بریندارو بێ سەروشوێنبوو. ئەوەی گومانیشی تێدا نییە ئەوەیە کە کۆمەڵەی ئەلعەلەم، دوای ئەویش [کۆمەڵەی] ئەلعەهد لە موسڵ رۆڵێکی کاریگەری لەسەر زۆرێک لەو شۆڕشانە هەبووە، ئەم راستیەش لەلایەن بەدواداچوان زانراوە.

«كـۆلۆنێل لیـچـمـان»یش، وەك ئاماژەمان بۆ كـرد ئەو ڕووداوە خوێناویانەی لە موسڵ ڕووبەڕووبوونەوە لە ماوەی فەرمانداریەكەی، هەر كە پایە نوێیەكەی لە ناوچەی (دلێم) وەرگرت و دەستبەكار بوو دووچاری چەند ڕووداوێكی زۆر مەترسیداربووەوە.

چونكە لە (١١)ی كانوونی یەكەمی (١٩١٩) رابەر «ڕەمەزان شلاش» هێرشی كردە سەر شاری (دیرە زور)و ئەو شارەی لە دەست ئینگلیزەكان رزگاركرد، كە ئەوكات لە ژێر دەستیان دابوو. (ئەمەش بەئامادەكاری بۆ كردن لە لایەن كۆمەڵەی (جەمعییەت ئەلعەعد ئەلعیراقی) لە سوریا و بەپشتگیری و یارمەتی ماددی و مەعنەویی جەنابی «ئەلئەمیر زێد ئەلموعەزەم»).

كاتێك خوالێخۆشبوو مەولوود موخلیس كرایە فەرمانداری سەربازیی لیوای (دیرە زور)، عیراقیەكان ئەم شوێنەیان كردە مەڵبەندی بزاقە شۆڕشگێڕیەكانیان لە دژی ئینگلیزەكان بەهۆی ڕێگای (ئەلمەیادین)و (ئەلبوكەمال)ی باشووری شاری (دیرە زور)ی سەرووی فوراتەوە، هەروەها لە ڕێگای (جەزیرە)ی ڕۆژئاوای موسڵ[٢]. ئەو شۆڕشانەی لە باشووری

(٢) بزاقە شۆڕشگێڕیەكانی (جەزیرە) بەو هێرشانەی ئەفسەرو سەرۆك خێڵە خۆبەختكەرەكان كردیانە سەر ڕێگای (شەرگات-موسڵ) دەستیان پێكرد. لەنێویاندا ئەو بزووتنەوەیەی بەسەرۆكایەتی فەهد كوڕی بەتیخ (فهد بن بطیخ) بۆ سەر (عێن ئەلدبس)بوو، كە تیایدا خۆبەختكەرەكان (المجاهدون) لە (٢٤)ی ئایاری (١٩٢٠) ئاگریان لە شەمەندەفەر بەردا. هەروەها ئەو شۆڕشەی كە لە بەرەبەیانی ڕۆژی (٤)ی حوزەیرانی (١٩٢٠) لە تەلەعەفەر بەرپابوو، كاتێك ئەفسەری پۆلیس ڕێزدار محەمەد عەلی ئەلحاج حوسێن ئەلنەعلبەند «كاپتن ستیوارت»ی سەركردەی پۆلیسەكانی كوشت، ئەمەش دوابەدوای نزیكبوونەوەی خۆبەختكەرەكان لە شارەكە بەسەركردایەتی ڕێزدار جەمیل ئەلمەدفەعی، كە لە ئەنجامدا «كاپتن بارلۆ»ی فەرمانداری سیاسی و چەندانی تر كوژران، هەروەها هەشت ئۆتۆمبێلی زرێپۆش و زیلی سەربازهەڵگر تێكشكێندران و نەفەرە ئینگلیز=

(دیره زور) روویاندابوو ئاستەنگێکی زۆریان لەو ناوانە بۆ کۆلۆنێل لیچمان دروستکرد، بەتایبەتیش دوای بەرپابوونی شۆڕشی ئەلرومێسە (الرومیشة) لە (٣٠)ی حوزەیرانی (١٩٢٠)، کە هەموو فوراتی ناوەڕاستی گرتەوەو هەڵکشا تاکو ناوچەی بالادەستی کۆلۆنێل لیچمان لە لیوای دلێم، ئەو بارە ناهەموارەش کێشەی پڕ لە توندوتیژی رووبەڕوو کردەوە، هەر ئەمەش بوو وای لێکرد ئەو هەڵسوکەوتە لەگەڵ شێخ زاری بنوێنێ، هەر ئەم هەڵسوکەوتەشی بووە هۆی گیان لەدەستدانی. هەر بەم بۆنەیەوە بەچاکم زانی دوو لەو رووداوانەی کە پێشتر تووشی کۆلۆنێل لیچمان ببوونەوە بگێڕمەوە، کە وەخت بوو لەناوی بەرن، بەڵام بەشێوەیەکی سەرسوڕهێنەر لێیان قورتار ببوو، بۆ ئەوەی خوێنەری بەڕێز بزانێت کە تا چ رادەیەک کۆلۆنێل لیچمان بڕوای بەخۆ هەبووەو، چۆن لە تەنگانەترین هەڵوێست و ناخۆشترین بارودۆخدا ژیانی خۆی خستۆتە مەترسی و تەنگانەوە.

---

= و هیندییەکانیشیان کوشتن، لەنێویاندا سێ سەرکردەی گرنگی ئینگلیزەکان بوون. هەروەها لە تەمموزی (١٩٢٠) خۆبەختکەرەکان بەسەرکردایەتی خوالێخۆشبوو جەمیل محەمەد ئال خەلیل ئەفەندی -کە دەستێکی بالای لە بزووتنەوەکەی تەلەعفەر هەبوو، هێرشێکی سەرکەوتوانەیان کردە سەر شوێنی (ئەلجرناف)ی نزیک (ئەلگەیارە)، لەم هێرشەدا پێکدادانێکی گەرم و گوڕ لە نێوان خۆبەختکەرەکان و هێزەکانی ئینگلیز روویدا، کە بەچەک و ژمارەوە لەوان زیاتربوون. ئەم پێکدادانە بەدرێژایی ئەو رۆژە بەردەوام بوو، پاشان خۆبەختکەرەکان بۆ نێوجەرگەی جەزیرە پاشەکشەیان کرد، دوای ئەوەی زیانێکی زۆری گیانییان لە هێزەکانی ئینگلیزدا. کۆمەڵەی (ئەلعەلەم) دوای ئەویش کۆمەڵەی (ئەلعەهد) لە موسڵ هەوڵ و کۆششێکی بێوچانی دەدا لەنێو خاکی جەزیرە، بۆ بەدیهێنانی ئامانجەکانی شۆڕش، ژمارەیەکی بەرچاوی ئەندامە ئازادیخوازەکانیشی بەشدارییان لە بزووتنەوەکەی (تەلەعفەر) و (ئەلجرناف) و هیتر کردبوو، هەندێکیشیان بەچەند بزووتنەوەیەکی شۆڕشگێڕیی سەربەخۆ هەڵسابوون کە لێرەدا جێگای روونکردنەوەو باسکردنیان نابێتەوە.

ڕووداوی یەکەم:

ئەوکاتەی لە موسڵ فەرماندار بوو، لە سەرەتاکانی ڕەمەزانیساڵی (١٣٣٧)ی ڕێککەوت لەگەڵ حوزەیرانی (١٩١٩) ڕووی کردە شارۆچکەی زاخۆ، (١٠) دە کەسیشی لە کوردە بەکرێگیراوەکانی لەگەڵدابوون، بڕێکی زۆری پارچە زێڕو زیو و پارەشی لەگەڵ خۆی بردبوو، تاکو بەسەر هەندێک لە خێڵەکان دابەشی بکات بۆ ئەوەی دڵیان پێ نەرم بکات و ببنە لایەنگیری ئینگلیزەکان. کاتێک گەیشتە (گەلیێ زاخۆ) هەندێک کوردی چەکدار ڕێگایان گرت و خۆی و پیاوەکانی دەستبەسەرکران، -هەڵبەت نەیان دەناسی- ویستیان بیکوژن، ئەویش بەپاڕانەوە پێیانی گوت من خەڵکی بەغدام و منداڵێکی زۆرم هەیە بۆ ئەوەی بەخێویان بکەم چوومەتە نێو خزمەتی ئینگلیزەکان، ئەوانیش منیان ناردووەتە موسڵ و لەوێشەوە لەگەڵ ئەم بەکرێگیراوانە بۆ زاخۆ نێردراوم تاکو ئەم پارانە بدەمە دەست فەرمانداری زاخۆ، ئینجا تکای لێکردن کە بەڕەڵای بکەن، دەوارو پارەکانیش بۆ خۆیان ببەن. ئەوانیش دڵیان پێ سووتاو نەیان کوشت، بەڵکو تەنها پشکنیان و دەمانچەکەیان برد لەگەڵ باری کاروانەکەو پارەکان. بەم شێوەیە بەکارامەیی خۆی توانی خۆی لە مردنێکی زۆر نزیک قورتار بکات.

ڕووداوی دووەم:

لە مانگی ئابی ساڵی (١٩١٩)دا چووە (بامەڕنێ) تاکو ڕاستەوخۆ سەرپەرشتی کردارە جەنگییەکان بکات لە دژی شۆڕشی نەقشبەندی کە لەو ناوە ڕوویدابوو. لە هەموو لایەکەوە گوللەی بۆ دەهات، گوللەیەک بەئەسپەکەی کەوت و تۆپاندی، بەڵام کۆلۆنێل لیچمان هیچ زیانێکی پێ نەگەیشت و ئەسپە کوژراوەکەی بەئەسپێکی تر گۆڕییەوەو بەسەرکەوتوویی چووە نێو (بامەڕنێ).

## چۆنیەتی گیرانی شێخ زاری

کاتێ ئەو شۆڕشەی کە شێخ زاری پێی هەڵسا شکستی هێنا، خێڵەکانیشی تووشی تێکشکان هاتن، پەنای بۆ باکووری (جەزیرە) برد سەر سنووری هاوبەشی نێوان عیراق و سوریا بردو، لەوێ بەدەربەدەری مایەوەو نەیتوانی بگەڕێتەوە ناوچە رەسەنەکەی خۆی، بەتایبەتی دوای دوورخستنەوەی ئەو لە بڕیاری لێبوردنی گشتی کە نوێنەری سامی «سێر پێرسی کۆکس» لە (٣٠)ی ئایاری ساڵی (١٩٢١) دەری کردبوو، هەروەها چەند کەسێکی تریش لەوانەی بەجوولانەوەی هاوشێوە هەڵسابوون لەم لێبوردنە دوورخرابوونەوە. حکومەتی بەریتانی بڕە پارەیەکی زۆریشی تەرخان کردبوو بۆ هەر کەسێک سەری شێخ زاری چ بەزیندوویەتی چ بەمردوویەتی بۆیان بهێنێ، ئەم پارەیەش بووە بەختی «میکائیل ئەرمەنی» ناوێک، کە تەڵەزگەیەکی بۆ دانایەوەو تووشی کرد.

پێش (١٣) سێزدە ساڵیش وتارێکم لە رۆژنامەی (العُمال)ی موسڵیدا -کە مامۆستا «سەعدەدین ئاڵ زیادە» خاوەنی بوو- لە ژێر نازناوی (النجمي)م بڵاوکردبووەوە، وەکو رەتدانەوەیێک بۆ نووسینەکەی «سێر ئارنۆڵد وڵسن» دەربارەی دەستگیرکردنی خوالێخۆشبوو شێخ زاری، لێرەدا بەچاکم زانی دووبارە بڵاوی بکەمەوە، چونکە راستیی نەگۆڕی سەبارەت بەچۆنیەتی دەستگیرکردنی شێخی ناوبراومان بۆ روون دەکاتەوە، ئەمەش دەقەکەیەتی[1]:

---

(١) رۆژنامەی (العالم العربي)یش کاتی خۆی ئەم وتارەی گواستبۆوە و لە ژمارەی (٢٤٢٠)ی رۆژی (٢٤)ی رەمەزانی (١٣٥٠)ی رێککەوت لەگەڵ (٢)ی شوباتی (١٩٣٢) بڵاوکربۆوەو ئەم پێشەکییە کورتەی خوارەوەشی بۆ نووسیبوو؛ رۆژنامەی (العُمال) وەک وڵامدانەوەیەک بۆ ئەو باسەی لە پەرتووکەکەی «سێر ئارنۆڵد وڵسن»دا هاتبوو سەبارەت بەچۆنیەتی دەستگیرکردنی خوالێخۆشبوو شێخ زاری ئەم (راستییەی) خوارەوەی -هەروەک چۆن لە دادگاش بەم شێوەیە سەلمێندراوە- لە ژێر ناسناوی (النجمي) وتارێکی بڵاوکردبۆوە، ئەمەش دەقی وڵامدانەوەکەیە:.........

ولّسن گوتبووی: تاکو (٨) هەشت سالّی بەسەر نەچوو شێخ زاری نەگیرا، ئەوەش بەهۆی ئۆتۆمبێلی (عەرەبێک)، کە ناسیبووی و، زانیبووی کە خەلاّتێک ئامادەکراوە بۆ هەر یەکێک سەری ئەویان بۆ بەرێت.

من دەلّێم: نکۆلّی لەوە ناکەین کە لەنێو عەرەبەکانیشدا، وەک هەر نەتەوەیەکی تر، ناپاک وسیخوڕ هەن، ئامادەن لە بەرامبەر چەند دەرهەمێکی کەم یان لە پێناو خستنەڕوویێکی لەناوچوو، زیان بەنەتەوەو رۆلّە نەبەردەکانی بگەیەنن، لەماوەی ئەم دوازدە سالّەی دواییشدا هەندێک عەرەبمان دەدیتن کارێکی زۆریان بۆ دەسەلاّتی داگیرکەر دەکرد، پاشماوە خراپەکانی ئەو خزمەتانەشیان هێشتان بەولاّتەوە دیارن.

هەربۆیە بەدوور دانەدەنرا کە هەندێک کەسی عەرەبیش هەولّی گرتنی شێخ زاری و کەسانی هاوشێوەیان دابێت، ئەوانەی حکومەت توانای نەبوو دەستگیریان بکات و تۆلّەیان لێ بکاتەوە. بەلاّم کێشەی گیرانی شێخ زاری -سوپاس بۆ خوا- دەستی (عەرەب)ێکی رەسەنی تێدا نەبوو، بەلّکو لە لایەن (ئەرمەن)ێکی پەناهێنەرەوە بەناوی «مکائیل»، کە «شێخ زاری»ی ناسیبوو و زانیی بوو کە هەر کەسێک سەرەکەی دەستکەوێت خەلاّت دەکرێت، بۆیە چووە ئەو دەشت و چۆلّەوانیەی کە شێخ زاری پەنای بۆ بردبوو، بۆ نانەوەی تەلّەزگەی دەستگیرکردنی. بەم شێوەیە ماوەیەکی دوورودرێژ بەئۆتۆمبێلەکەی لەو دەوروبەرە خۆی بەهێنان و بردنی نەفەری عەرەبەوە خەریک کرد، لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر دەیگواستنەوە.

رۆژێکیان هەوالّێکی پێ گەیشت کە شیخ زاری دەیەوێ لە -پێموایە (الأحسجة)ەوە- بڕواتە شوێنێک هەر لە جەزیرە بەناوی (أبي حامضة)، بۆ ئەم مەبەستەش پێویستی بەئۆتۆبێلەکەی ئەم (میوانە ناپاکە) هەیە. ئەویش خێرا تەلّەزگەکەی دانایەوەو، یەکێک لە خزمەکانی -دەلّێن باوکی بوو- ئاگادارکردەوە، کە ئەویشیان زوو زوو سەری لەم ناوانە دەدا، کە چاوەڕێی بکات لە شوێنێک پێشتر لەسەری رێککەوتبوون، «شێخ زاری»یش سواری ئۆتۆمبێلە ئاماژەبۆکراوەکە بوو بێی ئەوەی یەکێک لە

رۆڵەکانی خێڵەکەی لەگەڵدا بێت، چونکە لە خۆی دڵنیابوو و پشتی بەشوفێری ئۆتۆمبێلە ئاماژەبۆکراوەکە بەست، کە لەو دەڤەرە ناسراوبوو. زۆر جاریش بەویستی خۆی لە شوێنێک بۆ شوێنێکی تر گواستبوویەوە.

دوای ئەوەی ئۆتۆمبێلەکە مەودایەکی بڕی، لە ڕێگادا تووشی ئەرمەنەکەی دووەم هاتن -وەک پێشتر ئاماژەمان بۆ کرد-، ئەویش شادومانی خۆی نیشاندا بۆ ئەم ڕێککەوتەو داوای سوارکردنی کرد بەبیانووی ئەوەی گوایە چەند کاروبارێکی لەو ناوانە هەیە. بەم شێوەیە شێخ زاری بەتەڵەوەبوو، دوای ماوەیەک دیتی ئۆتۆمبێلەکە بۆ ئەو ئاراستەیەی ئەو مەبەستی بوو ناڕوات، هەروەها لە هەڵسوکەوتی ئەم هەردوو پیاوەدا گومانی کەوتە دڵەوەو، بۆی یەکلابووەوە کە ئیتر رووبەڕووی مەترسی دەبێتەوە. هەلی خۆدەربازکردنیشی نەبوو لە دەست ئەم هەردوو پیاوە، نەخاسمە دوای ئەوەی بۆی روونبووەوە کە (ئاگرو ئاسن[*])یان لایە، لە کاتێکدا خۆی دەستبەتاڵ و بێ چەکە، ئۆتۆمبێلەکەش بەبێ وەستان ڕێگای دەبڕی. بەم شێوەیە خۆی دا بەدەست ئەمری واقیع و ملکەچی ویستی ئەم پیاوە ستەمکارانەی کرد، تاکو گەیاندیانە قەزای شەنگار (سنجار)و، لە رۆژی (٣)یەمی مانگی تشرینی دووەمی ساڵی (١٩٢٧) دایانەدەست حکومەت، (قایمقامی ئەوسای قەزاکە «یوسف نەمرود رەسام»بوو -کە راوێژکاری فەرمانداره ئینگلیزەکەی وڵات بوو لە رۆژانی داگیرکاریەتیدا- لێیانی وەرگرت)، لە شەنگاریشەوە بەدەستبەستراوی نێردرایە موسڵ، لەوێشەوە رەوانەی بەغدا کرا.

بەمە بۆمان روون دەبێتەوە کە شێخ زاری لە لایەن (عەرەبێک)ەوە نەگیراوە وەک «سێر ئارنۆڵد وڵسن» باسی لێوە کردبوو، بەڵکو لە لایەن ئەرمەنێکی پەناهێنەرەوە، هەر دوای ئەوەی بەهەواڵی خەڵاتە گرانبەهاکەی

(*) [لەوانەیە مەبەست لە (ئاگرو ئاسن) چەک و ئۆتۆمبێل بێت- وەرگێڕ]

زانیبوو ئەرکی دانانەوەی تەڵەکەی گرتە ئەستۆ. دوای وەرگرتنی خەڵاتەکەش یەکسەر عیراقی بەجێهێشت، دەشڵێن ئێستا لە میسر نیشتەجێیە.

**شێخ زاری لە بەردەم دادگادا**

دادگاییکردنی خوالێخۆشبوو شێخ زاری لە بەغدا لە بەرامبەر دادگای باڵای سزا بەڕێوەچوو، کە دادوەرێکی ئینگلیز سەرۆکایەتیی دەکرد، لە (٣٠)ی کانوونی دووەمی ساڵی (١٩٢٨) بڕیاری لەسێدارەدانی درا، داوتریش بڕیاری سزاکەی بۆ بەندکردنی هەتاهەتایی گۆڕدرا. بەڵام ڕۆژگار بواری بەشێخ زاری نەداو لە یەکەم شەوی مانگی شوبات، واتە دوای دوو ڕۆژ لە دەرچوونی بڕیاری سزاکە، لە نەخۆشخانەی پاشایەتی لە بەغدا -کە بەهۆی نەخۆش کەوتنی بردرابووە ئەوێ- کۆچی دوایی کرد.

دوای ئەوەی هەواڵی گیان لەدەستدانیشی لە بەغدا بڵاوبووەوە، جەماوەرێکی زۆر بەرەو نەخۆشتخانەکە ڕۆیشت و تەرمەکەیان هەڵگرت و، پرسەیەکی شایستەو لە شێوەی خۆپیشاندانێکی گەرم و گوڕی پڕ لە هاوارو ناڵەی دڵگەرمی میللییان بۆ سازکرد تاکو گەیاندیانە دوا مەنزڵگای لە گۆڕستانی شێخ مەعروف ئەلکەرخی و لە تەنیشت گۆڕی شێخ داوود ئەلزاهری نێژرا. ڕۆژنامە نیشتمانییەکانی بەغدا، لە پێش هەمووشیانەوە ڕۆژنامەی (الاستقلال)، کە تێکۆشەری خوالێخۆشبوو عەبدولغەفوور ئەلبەدری خاوەنی بوو، لاپەڕەکانی پڕبوون لە ڕەشایی، وەک پرسەو ڕێزلێنانێک لە گیانی ئەم پاڵەوانە دلێرە.

جیاوازی گێڕانەوەکان

**دەربارەی بکوژانی کۆلۆنێل لیچمان و ئەو شوێنەی لێی کوژراو ئەو کەسەی لەگەڵی کوژرا**

لە لاپەڕەی (١٦٥)ی پەرتووکەکەی «مس بیل»دا کە بەناوی (تاریخ العراق القریب)ە، لە بارەی بڵاوبوونەوەی پەشێوی و شپرزەبوونی ئاساییش لە دەرەوەی سنووری بەغدا هاتووە:

(... کۆلۆنێل لیچمان بووە نێچیرێک بۆ ئەو رق لێبوونەوەیەی کە لەنێو دەروونی بەرچاوترین شێخی ئەو خێڵانەی لەسەر رێگای (فەلوجە)بوون دەخولایەوە، کە ناوە ناوە لیچمان سەردانی دەکرد لەنێو رەشماڵەکەیدا، کوڕەکەی شێخ بۆسەیەکی بۆ نایەوەو هەرکە لە خێمەکە هاتەدەر کوشتی).

وەرگێڕی پەرتووکە ناوبراوەکە، مامۆستا جەعفەر خەیات، بۆچوونی خۆی لەسەر بەرچاوترین شێخی خێڵەکان دەربڕی و، گوتی: ئەو، خوالێخۆشبوو «شێخ زاری ئەلمەحمود»ەو شێخی خێڵی (زەوبەع)ە. سەبارەت کوڕەکەشی، گوتی: شێخ خەمیسی کوڕی زاری یە.

لە کاتێکدا (بەگداد تایمز) کە گوزارشتی لە راوبۆچوونی ئینگلیزەکان دەکرد، ئەوکات رایگەیاندبوو کە لەوکاتەی کۆلۆنێل لیچمان لە میوانداریەتی شێخ زاری بوو، لەو شەوەی کە لەنێو خێمەکەیدا نووستبوو لەناوبردرا.

مامۆستای رێزدار «عەلی بارزگان»یش لە لاپەڕەی (١٦٨)ی پەرتووکەکەی (الوقائع الحقیقیة)دا نووسیبووی کە کۆلۆنێل لیچمان لەنێو دیوەخانەکەی شێخدا سووکایەتی بەشێخ کردبوو، بەڵام رەتی کردەوە لە دیوەخانەکەیدا کوژرا بێت، بەڵکو روونی کردەوە کە شێخ زاری خۆی و هەندێک لە کەسانی خانەوادەکەی لەگەڵ لیچمان رۆیشتن، تاکو گەیشتنە بەر دەرگای (خان)ەکە، ئەوسا یەکێکیان تفەنگەکەی ئاراستەکردو گوللەیەکی پێوەناو کوشتی. بەڵام ناوی بکوژەکەی نەهێناوە.

«شێخ فەریق مزهر ئاڵ فیرعەون»یش لە لاپەڕەی (٣١٠)ی بەرگی یەکەمی پەرتووکەکەی (الحقائق الناصعة)دا گوتبووی لیچمان لەنێو ئەو مەخفەرەی کە نزیکەی (١٠٠) مەترێک لە (خان)ەکەوە دووربوو کوژرا.

مامۆستای رێزدار «عەبدولرەزاق ئەلحەسەنی»یش لە لاپەڕەی (١٦١)ی پەرتووکەکەی (الثورة العراقية الكبرى)دا نووسیویەتی کە کوشتنەکە لەنێو (خان النقطة)دا روویداوە.

بەڵام خوالێخۆشبوو مامۆستا «سلیمان فەیزی» لە لاپەڕەی (٢٥٨)ی پەرتووکەکەی (في غمرة النضال)دا دەڵێت: داگیرکردنی (تەلەعفەر) بەیارمەتی شێخ زاری و هەردوو کوڕەکەی خامس و سلیمان بوو، هەر لەوێش کوشتارگە بەناوبانگەکە روویدا کە کۆلۆنێل لیچمان ی تیادا کوژرا.

من دەڵێم: ئەم گێڕانەوەیە نامۆیە تەنها خوالێخۆشبوو مامۆستا سلێمان فەیزی باسی کردووە، هەروەها لە باسکردنی هەندێک لایەنی تری کە ببوونە هۆی ئەو (غمرة(*))ەیە لایداوە. لە بارەی بکوژی «کۆلۆنێل لیچمان»یش، ئەوە هەر یەک لە شێخ مەهدی ئەلبەسیر و مامۆستا جەعفەر خەیات و رۆژنامەی (بەگداد تایمز) کۆکبوون لەسەر ئەوەی کە بکوژەکە شێخ خەمیسی کوڕی شێخ زاری یە.

بەڵام شێخ [مەهدی] ئەلبەسیر ئەوەی بۆ زیاد کردبوو، کە باوکەکەش بەشداری کوڕەکەی کردووە لەم کوشتنەدا.

بەڵام مامۆستا ئەلحەسەنی گوتبووی کە بکوژەکەی سلیمانی کوڕی شێخ زاری و هەردوو ئامۆزاکەی «سگەب»و «سعەب»بوونە، هەمووشیان لوولەی دەمانچەکانیان ئاراستەی سەری کۆلۆنێل لیچمان کردو تەقەیان لێکردو کوشتیان.

«شێخ فەریق مزهر»یش هاوڕابوو لەگەڵ مامۆستا ئەلحەسەنی لەوەی کە

---

(*) [(غمرة) وشەیەکی عەرەبییە واتە (گەرم وگوڕی/شادومانی)- وەرگێڕ]

بکوژەکەی لیچمەن «سلیمان» و«سعەب»بوون، بەبێ ئەوەی ناوی «سگەب» بهێنێت، بەڵام ناوی هەر یەکێک لە «سلیبی کوڕی مجباس» و«دەحام کوڕی فەرحان»ی بۆ زیاد کردن.

لایەنی جیاوازیش لە بارەی ئەو کەسەی لەگەڵ کۆلۆنێل لیچمان کوژرابوو بەم شێوەیە بوو:

ڕۆژنامەی (بەگداد تایمز) گوتبووی کوژراوەکە شوفێری ئۆتۆمبێلەکەی بوو، کە ڕۆڵەیەکی عەرەبە. لە کاتێکدا ئەلحەسەنی ناوی شوفێرە کوژراوەکە بە«حەسەن» ناودەبات و دەڵێت کابرایەکی (هیندی)یە. ئێمەش لەگەڵ ڕێزدار ئەلحەسەنی کۆکین کە ناوی شوفێرە کوژراوەکە «حەسەن»ە، بەڵام هیندی نییە، هەروەها عەرەبیش نییە وەک (بەگداد تایمز) باسی لێوە کردبوو. بەڵکو ئەم «حەسەن»ە کوردە، لە کوردەکانی ئازەربێجانی ئێرانە، لە ماوەی فەرمانداریەتی «کۆلۆنێل لیچمان»یش لە موسڵ لە گشت هاتوچۆکانی لەگەڵیدا دەمان بینی، لە هەرەتی لاویەتی و گەنجیدابوو

## پێرست



**وتاری یەکەم:**



**وتاری دووەم:**

**وتاری سێیەم:**

**ژێدەرەکان:**

١- ابراهيم خليل أحمد: التأريخ والمؤرخون الموصليون المعاصرون، بحث ضمن موسوعة الموصل الحضارية، ج ٥، الموصل- ١٩٩٢.

٢- شاكر خصباك: الكرد والمسألة الكردية، منشورات الثقافة الجديدة، بغداد- ١٩٥٩.

٣- عبدالمنعم الغلامي: أسرار الكفاح الوطني في الموصل ١٩٠٨-١٩٢٥، مطبعة شفيق، ج ١، بغداد- ١٩٥٨.

٤- عبدالمنعم الغلامي: ثورتنا في شمال العراق ١٩١٩-١٩٢٠، مطبعة شفيق، ج ١، بغداد- ١٩٦٦.

٥- عزيز شريف: المسألة الكردية في العراق، (دون مكان)، ١٩٨٧.

٦- فاضل البراك: مصطفى البارزاني الاسطورة والحقيقة، مطابع دار الشؤون الثقافية العامة، بغداد-١٩٨٩.